کتێبي دووەم (٢) خولی زانستە شەرعیەکان

# شیکردنەوەی

# مەنزومەی ابن ابی کف

لە بنچینەکانی مەزهەبي ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێ بێت

لە دانانی:سیدی احمد بن محمد ابن احمد ( ابن ابی کف) المحجوبی الولاتی الموریتانی

ت: ١٢٧٥ هـ


کۆکردنەوە و نوسین:

م. عبدالرحمن شمس الدین نزاری


١٤٤٢ هـ

# شیکردنەوەی مەنزومەی إبن أبی کف

**لە سەر زانستی أصول الفقه لە مەزهەبی ئیمامی مالیك** رەحمەتی خوای لێ بێت

**دانەری مەنزومە:**

**سیدی أحمد بن محمد بن أحمد ( إبن أبی کف) المحجوبی الولاتی الموریتانی**

**لە نوسین و شیکردنەوەی:**

**عبدالرحمن شمس الدین عثمان نزاری**

**ئەکادیمیای گەنجینەکانی سوننەت بۆ زانستە شەرعیەکان**

**١٤٤٢**



# پێشەکی

هەلبژاردنی ئەم مەنزومەیە، واتە مەنزومەی ابن أبی کف لە زانستی ( علم الأصول) بۆ شیکردنەوە، لە بەر چەند هۆکارێك بووە. سەرەتا زانستی ( علم الأصول) زانستێکی گرنگ و بنەرەتیە لە زانستە شەرعیەکان و زانستخوازی شەرعی پێویستیان پێ ی هەیە لە پێناو تێگەیشتن لە فیقە و مەزهەبەکان و حوکمە شەرعیەکان. هەروەها ( علم الأصول) لای ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای تعالی لێ بێت بەرفراوانە و زیاترین سەرچاوەی لە خۆ گرتووە.

دیارە جگە لە ئیمامی شافعی رەحمەتی خوای لێ بێت کە لە کتابی (الرسالة) باسی ئەم زانستە ی کردووە و ئیمامی ئەحمەدی حەنبەل ڕەحمەتی خوای لێ بێت، کە کتابی دانراوی هەیە تیایاندا باس لە بنچینەکانی خۆی دەکات، پێشەوایانی سەر مەزهەبی تر، کەس بە تایبەت کتێبی لە سەر ئەم زانستە دانەناوە بەلام بنچینەکانیان بۆ هەلێنجانی حوکمە شەرعیەکان لە فیقهەکەیان دەخوێنریتەوە یا ئاماژە بە قسەی هەندێ زانا دەکرێت بۆ زانینی سەرچاوەکانی وەرگرتنی حوکمە شەرعیەکان.

**سەرچاوە بنەڕتیەکان لای ئەم چوار پێشەوایە بەم جۆرە لێکدراوەتەوە:**

**ئیمامی ئەبو حەنیفە** رەحمەتی خوای لێ بێت: ( **قورئان، سوننەت، کۆدەنگی ( اجماع)، ووتەی هاوەلان، بەراورد (قیاس)، بە چاکە زانین ( إستحسان)، و نەریت)**. لە کتابی (انتقاء) هاتووە: ئەبو حەنیفە رەحمەتی خوای لێ بێت ووتویەتی: کار بە کیتابی خوای تعالی دەکەم، گەر حوکمەکەم نەدۆزیەوە، کار بە سوننەتی پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم دەکەم، گەر نا، لە کتابی خوا ی تعالی و سوننەتی پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم، نەم دۆزیەوە کار بە ووتەی هاوەلان دەکەم و کار بە قسەی هەندێکیان دەکەم و واز لە ووتەی هەندێکیان دەهێنم و لە ووتەی ئەوان دەرناچم بۆ ووتەی غەیری ئەوان ( واتە لە قسەی هاوەلان دەرناچم بۆ ئەوەی کار بە قسەی غەیری ئەوان واتە تابعین و ئەوانەی لە خوار ئەوان بکەم)، گەر کار گەیشتە ئیبراهیم و شەعبی و ئیبن سیرین و حەسەن و عەتا و سەعیدی کوری موسەیب و ناوی چەند کەسی هێنا.. ئەوانە کۆمەلێك بوون ئیجتیهادیان کرد، منیش وەك ئەوان ئیجتیهاد دەکەم).[1]

**ئیمامی مالیك** رەحمەتی خوای لێ بێت: ( **قورئان، سوننەت، کردەوەی خەلکی مەدینە، ووتەی هاوەلان، بەرژەوەندیە گشتیەکان ( مصالح المرسلة)، بەراورد (قیاس)، ڕێگە گرتن لە مەهانەکان ( سد الذرائع).**

**ئیمامی شافعی** رەحمەتی خوای لێ بێت: ( **قورئان، سوننەت، کۆدەنگی (اجماع)، ووتەی هاوەلان گەر ووتەی پێچەوانەی ئەو نەبوو لای هەندێکیان، کاتی هەبوونی ناکۆکی لە نێو ووتەی هاوەلان کار بە ووتەی ئەوانە دەکات کە نزیکترن لە قورئان و سوننەت، بەراورد (قیاس).**

---

[1] الانتقاء، ابن عبدالبر، ١/ ٨٢.

**ئیمامی ئەحمەد** ڕەحمەتی خوای لێ بێت: **( قورئان، سوننەت، کۆدەنگی، وەرگرتنی حوکمی پێشوو (استصحاب)، فەتوای هاوەلان، بەرژەوەندیەکان، ڕێگە گرتن لە مەهانەکان (سد الذرائع)، شەریعەتی ئەوانەی پیشوو، بە چاك زانین ( إستحسان)، نەریت، بەراورد ( قیاس))**.[٢]

**بۆیە لە بەر بەفراوان بوونی بنچینەکانی ئیمامی مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە زۆربەی سەرچاوە و بنچینەکان لە خۆ دەگرێت گەر هەموویان نەبێت، بۆیە ئەم مەنزومەمان هەلبژارد بۆ شیکردنەوە. بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەکی زانستی پشت بە الله سبحانە و تعالی بۆ فێرخوازانی زانستی شەرعی ئەوانەی دەیانەوێت بە شێوازی سەرتایی لەم زانستە گرنگە شارەزایی وەرگرن.**

**هاوکات، ئەم مەنزومەیە کورتە و لە بەر کردنیشی ئاسانە و هانی هەموو فێرخوازێك دەدەین بۆ لە بەر کردنی ئەم مەنزومەیە.**

**گەر توانیمان بێت لە شیکردنەوەی ئەم مەنزومەیە بپێکین ئەوا لە فەزلی الله جل جلالە بووە و گەر هەلەمان کردبێت تیایدا و کەم و کورتی تیایدا هەبوو ئەوا لە خۆمان و شەیتانە علیە اللعنە. پشت و پەناش تەنیا بە خوای گەورە دەبەستین.**

---

[٢] أصول مذهب الإمام أحمد، د. عبدالله بن عبدالمحسن التركي.

# ژیاننامەی ئیمامی مالیك

**ناو و نازناو و نەسەبی:**

پێشەوای (دارالهجرة) أبو عبدالله مالك بن أنس بن مالك بن أبي عامر بن عمرو الحميرى، ئینجا الأصبحي المدني یە و دایکی: عالیە بنت شریك ی ئەزدیە و لە سالی ٩٣ ی هیجری لە دایك بووە لەو سالەی کە خزمەتکاری پیغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم، واتە ئەنەسی کوری مالیك رەزای خوای لێ بێت وەفاتی کرد . و لە ڕووی گوزەرانەوە لە خۆشی و هەبوون پەروەردە بووە.

**مامۆستا و قوتابیەکانی:**

هەر لە منالیەوە بە دوای زانست گەڕاوە و لە نافع و سەعیدی مەقبوری و عامری کوری عەبدولای زوبەیر و ئیبن مونکەدیر و زوهری و عبدالله ی کوڕی دینار وئیسحاقی کوڕی عبدالله ی کوری ئەبی تەڵحە، ئەیوبی سەختیانی زانای بەسرە، ئەیوبی کوڕی حەبیبی جوهەنی، ئیبراهیم ی کوڕی عوقبە، حومەیدی تەویل، سوهەیلی کوری ئەبی صالح، صالحی کوڕی کەیسان، زەمورەی کوڕی سەعید، عەبدولای کوڕی دینار، زوهری، و خەلکیکی زۆر زانستی وەرگرتووە. ئیمامی زەهەبی لە کتابی سیر أعلام النبلا دەفەرمویێت ژمارەی مامۆستاکانی شەش سەد و سی و شەش کەس بووە. هەندێ لە مامۆستایانی فەرمودەیان لێ گێراوەتەوە وەك مامی خۆی ئەبو سوهەیل، زوهری و یەحیا ئیبن سعید، یزید ئیبنو الهاد، زەیدی ئیبن ئەبی ئونەیسە و عومەری ئیبن محمد ی ئیبنی زەید و چەند کەسی تریش. هەندێ لە هاو سەردەمەکانیشی ئەمانە بوون کە ریوایەتیان لە ئیمامی مالیك کردووە: ئیبن جورەیج، ئەبو حەنیفە، عمرو بن حاریس، ئەوزاعی و شوعبە و سەوری و عبدالرحمن بن مەهدی سوفیانی ئیبن عویەینە و عەبدالله ی ئیبن موبارەك وەکیع و یەحیای قەتتان و ئەبو عەبدالله ی شافعی و ئەبو داودی تەیالیسی ئەبو نوعەیم فەزلی ئیبن دوکەین و محمد ئیبن عومەری ی واقیدی ...هتد.[٣]

قوتابیەکانی: زۆر قوتابی هەبووە کە لە وولاتان بلاوەیان کرد و مەزهەبی ئیمامی مالیکیان بلاو کردەوە لە بەناوبانگەکانیان ئاماژە بە هەندێ کەس دەکەین:

لە میسر: ئیبنو قاسم هەروەها ئەشهەب، لە ئەفریقیا: ئەسەد ئیبنو فورات، لە ئەندەلوس: یحیا بن یەحیای لەیسی، لە عیراق: عبدالرحمن بن مەهدی و حەسان العنبری و عبدالله بن مسلمه بن قعنب التمیمی.[٤]

ئیمامی مالیك لە هەرەتی لاوی بە دوای زانست گەڕاوە و لە تەمەنی بیست و یەك سالی بۆ پرسیار و فەتوا دانیشتووە و لە هەموو ولاتان خەڵکی ڕووی تێکردووە بۆ وەرگتنی زانست و فەرمودە .

زانایان دەڵێن ئەم فەرمودیە ڕەنگە ئیمامی مالیك بگرێتەوە: ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێت لە پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم دەگێڕێتەوە کە دەفەرمویێت: (خەلکی بە ووشترەکانیان بە دوای زانست دەگەڕێن، ئێنجا کەس لە زاناکەی مەدینە زاناتر نادۆزنەوە).[٥]

---

[٣] کتابی سیر اعلام النبلا ی ئیمامی زەهەبی م. شامله ل ١٥٠

[٤] المعونه لە سەر مەزهەبی زانای مەدینە، سەعلەبی (٥٨/١)

[٥] کتابی سیر اعلام النبلا ی ئیمامی زەهەبی م. شامله ل ١٥٤



**کتاب و بەرهەمەکانی ئیمامی مالیك:**

دیارە بە ناوبانگ ترین پەرتووکی ئیمامی مالیك ( موطأ) ە کە تایبەتە بە گێرانەوەی فەرموده و لە ٠نۆ) کتێبەکان واتە ( الكتب التسعة)دەژمێردرێت. ئەم پەرتوکە بە ریوایەتی چەند قوتابیەکی ئیمامی مالیك گێردراوەتەوە لە وانە:

علي بن زياد التونسي(١٨٣هـ)

محمد بن الحسن الشيباني(١٨٩هـ)

عبد الرحمن بن القاسم العتقي(١٩١هـ)

عبد الله بن وهب المصري (١٩٧هـ)

عبد الله بن مسلمة القعنبي(٢٢١هـ)

يحيى بن عبد الله بن بُكير المصري (٢٣١هـ)

يحيى بن يحيى بن كثير الليثي (٢٣٤هـ)[٦]

سُويد بن سعيد الحَدثاني (٢٤٠هـ)

أبي مصعب الزهري المدني (٢٤٨هـ)

سەبارەت بە وەفاتی ئیمامی مالیك بیست و دوو رۆژ نەخۆش بووە و دواتر لە سالی ١٧٩ ی کۆچی لە شاری مەدینە گیانی سپاردووە و لە سەردەمی هارون الرشيد ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت. [٧]

[٦] وَاة المُوطأ عَن مَالك بن أنس رَحمه الله، د. محمد بن علي اليـولو الجزولي، بحث منشور في موقع الرابطة المحمدية للعلماء مغرب

[٧] کتابی ( مالیك)، محمد ئەبو زوهرە، ل ٥٠

# ژیاننامەی دانەری مەنزومە

**دانەری ئەم مەنزومەیە:**

ناوی **سیدی أحمد بن محمد** ە کە کونیەو لەقەبەکەی بریتیە لە ئەبی کەف مەحجوبی ولاتی موریتانی.

ئەم زانایە، سەرقاڵی کاری دادوەری واتە قەزاوەت بووە و بەرهەمەکانیشی بریتین لە :

- المهيع الجلية في القواعد الفقهية،
- قرة العين نظم المنجور في القواعد الفقهية
- نظم تبصرة إبن فرحون في القضاء
- تبيين المقاصد على تسهيل الفوائد لإبن مالك فى النحو
- نظم فى التوحيد
- نظم فى أصول الإمام المالك کە بە مەنزومەی ئەبی کەف ناسراوە. ئەم زانایە لە ساڵی ١٢٧٥ ی هیجری کۆچی دوایی کردووە.[٨]

**بەناوبانگترین شیکردنەوەی ئەم مەنزومەیە کتابی إيصال السالك فى أصول الإمام المالك ە کە لە دانانی شیخ: سیدی محمد یحیی بن عمر المختار بن طالب عبدالله الولاتی الشنقیطی یە کەلە ساڵی ١٣٣٠ ی هیجری /١٩١٢ ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.**

[٨] تقریب و تهذیب إیصال السالك في أصول الإمام مالك، أستاذ کریم امصنصف، ل ٧

# پێناسەی زانستی ئوصول و سەرەتای پەیدابوونی

**پێناسە:**

**أصول الفقه**: **أصول** واتە بنچینە و ئەوەی شتی تر ی لە سەر بنات دەنرێت. و **فقه**: بریتیە لە تێگەیشتن و زانینی حوکمە شەرعیەکان ئەوانەی کە لە ڕێگە ئیجتیهادەوە دەزانرێن.[٩] دواتر لە شیکردنەوەی مەنزومە بە تێر و تەسەلی پێناسەکەی هاتووە.

حوکمە شەرعیەکانیش دابەش دەبن بۆ دوو بەش: ١.**حوکمە تەکلیفیەکان**: کە بریتین لە فەرمانەکانی خوای تعالی کە پەیوەستن بە کردەوەکانی ئەوانەی تەکلیف کراون بە شێوەی کارکردن یا هەلبژاردن و ٢. **حوکمی دانراو** (وضعي): کە بریتیە لە وەی ( شارع) دایناوە لە هۆکار و مەرج و بەربەستەکان کە بە هۆیانەوە حوکمی شەرعی دەزانرێت لە ڕووی سەلماندن یا ڕەت کردنەوە.

**حوکمە تەکلیفیەکانیش دابەش دەبنە سەر ٥ بەش**[١٠]:

١. **واجب** ( کە ئەمر بکرێت بە ئەنجام دانی شتێك بە دلنیایەوە)
٢. **مندوب** ( ئەمر کردن بە ئەنجام دانی شتێك نە ك بە دلنیایەوە)
٣. **محرم** ( ئەمر بە وازهێنان بە دلنیایەوە)
٤. **مکروە** ( ئەمر بە وازهێنان نەك بە دلنیایەوە)
٥. **مباح** ( هەلبژاردن لە نێوان ئەنجام دان یا وازهێنان)

**پەیدا بوونی زانستی ئوصول:**

وەك هەموو زانستە شەرعیەکانی تر، زانستی ئوصول یا بنچینە سەرەکیەکانی فیقە وەك زانستیکی سەربەخۆ لە سەردەمی خۆشەویستمان صل الله علیە و سلم نەبووە بەلکو لە کۆتایی سەدەی دووەم پایەکانی داڕێژراونەتەوە و بۆتە زانستێکی سەربەخۆ.[١١]

هەنگاوە مێژوویەکانی پەیدا بوونی بنەماکانی ئوصول لە سەردەمی پێغەمبەرمان صل الله علیە و سلم و هاوەلان و تابعین و دوای ئەوان ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێ بێت دابەش کراوە کە بە کورتی باسی هەر قۆناغێك دەکەین:

لە سەر دەمی پێغەمبەری خۆشەویستمان صل الله علیە و سلم کە سەردەمی دابەزینی سروش (وحی) بووە و پیغەمبەری خۆشەویست صل الله علیە و سلم، خۆی ئامادە بووە هاوەلان بۆ هەر کارێك و حوکمێك گەڕاونەتەوە لای رسول الله صل الله علیە و سلم و هەندێ جار خۆشیان ( واتە هاوەڵان) ڕەزای خوایان لێ بێت ئیجتیهادیان کردووە و بە پێ ی کتاب و سوننەت و هەندێ جار بە هۆی قیاس ڕایان دەربڕیوە و بۆ زانینی ڕاستی و دروستی ئیجتیهادەکەیان گەڕاونەتەوە لای پێغەمبەرمان صل الله علیە و سلم، وبۆ نموونە لە مەسەلەی ئەمری پیغەمبەر صل الله علیە و سلم لە کاتی غەزای

---

[٩] الورقات، لأبی معالی الجوینی، ل ١

[١٠] مذکرة أصول الفقه، ازانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی منورە ل ٣

[١١] زاد الطالب في أصول الفقة، أبو براء المصری ل.١٥

بەنو قورەیزە فەرموی ( **لا يُصَلِّيَنَّ أحَدٌ العَصْرَ إلَّا في بَنِي قُرَيْظَةَ فأدْرَكَ بَعْضُهُمُ العَصْرَ في الطَّرِيقِ، فَقالَ بَعْضُهُمْ: لا نُصَلِّي حتَّى نَأْتِيَهَا، وقالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي، لَمْ يُرِدْ مِنَّا ذلكَ، فَذُكِرَ ذلكَ للنبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فَلَمْ يُعَنِّفْ واحِدًا منهمْ.**) واتە نوێژی عەسر نەکەن مەگەر لای بەنو قورەیزە نەبێت، ئێنجا هەندێ کەس لە ڕێگا نوێژی عەسری لێ داهات بۆیە هەندێکیان ووتیان نایکەین تا نەگەینە لایان و هەندێکی تر ووتیان بەلکو نوێژەکە دەکەین ئەمە لە ئێمە داوا نەکراوە، ئەمەیان بۆ پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم گێڕایەوە و کەسی سەرزەنش نەکرد.
خودی رسول الله صل الله علیه و سلم هەندێ جار بەلگەی بە عموم ی قورئان دەهینایەوە بۆ کارە لاوەکیەکان سەرزەنش کردنی ئوبەی کوڕی کەعب ڕەزای خوای لێ بێت کاتێك وولامی پیغەمبەری خوای صل الله علیه و سلمی نەدایەوە چونکە لە ناو نوێژ بوو، پێغەمبەری خواش صل الله علیه و سلم بەلگەی بە ئەم ئایەتە هێنایەوە بە گشتی ( **يا أيها الذين ءامنوا استجيبوا لله و للرسول إذا دعاكم لما يحييكم** ) **الأنفال**:٢٤.

دوای وەفاتی رسول الله صل الله علیه و سلم، هەندێ لە گەورە هاوەلان ڕەزای خوایان لێ بێت، بە کاری دادوەری و فەتوا بۆ خەلکی ڕاسپێردران وەك عمر ی کوری خەتتاب، و عبدالله ی کوڕی مەسعود و علی کوڕی ئەبو تالیب رەزای خوا لە هەموویان بێت. هەرچەندە ئەم هاوەلانە بە کەیفی خۆیان فەتوایان نەداوە و بەلکو ئەمانە ڕەزای خوایان لێ بێت شارەزایی تەواویان لە سەر زمانی عەرەبی هەبووە و ئاگاداری تەوایان هەبووە لە سەر هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان و فەرمودەکان و ناسخ و منسوخ و مجمل و مبین و ڕها و سنوردار و گشتی و تایبەتیان زانیوە٬ سەرەڕای زانیاریان لە سەر مقاصد الشريعه واتە ئامانجەکانی شەرعی خوا بە هۆی هاوەڵێتی کردنیان لەگەل پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم.[١٢]
نمونەش بۆ فەتوا و بنچینەی فەتوادان لای هەندێ لە هاوەڵە بەڕێزەکان: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ڕەزای خوای لێ بێت حوکمی ئەو کەسەی شەڕاب دەخواتەوە لە ٤٠ جەردە کردی بە ٨٠ دانە و بەم شێوەیە بەلگەی بۆ هێنایەوە ( من وادەبینم ئەوەی شەراب دەخواتەوە سەرخۆش دەبێت، و ئەوەی سەرخۆش بوو وەڕێنە دەکات، و ئەوەی وەڕێنە بکات ئیفتیرا دەکات و بۆیە وادەبینم حەدەکەی حەدی قەزف بێت).

## کتێب و سەرچاوەکانی زانستی ئوصول

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا سەرۆك مەزهەبەکان کتێبی تایبەتیان لە سەر ئوصول دانەناوە کە تەنیا ئەم بابەتە لە خۆ بگرێت بەلکو لە کۆی فەتوا و حوکمە کان لە لقە فیقهیەکان و مەزهەبەکەیان زانایان هەندێ بنچینەیان هەلێنجاوە.
شێوازی دانانی بنچینەکانیش جیاوازی هەیە لە نێوان (**متكلمين و فقهاء**). متکلمین ئەوانەن کە بۆ لێکدانەوە ی حوکمەکان زیاتر پشت بە بەلگەهێنانەوە بە بەلگەی شەرعی و عەقلی دەبەستن و بە زۆری لە لقە فیقهیەکان دایان دەبرێنێن و ڕێبازێکی تێکەلە لە نێوان زانستی کەلام و زانستی ئوصول و پییان وایە کە دەبێت زانستی کەلام بنچینە و کۆلەگەی زانستی ئوصول بێت. زانستی کەلامیش واتە لێکدانەوەی عەقلی بۆ بابەتە شەرعیەکان و نزیکە لە ڕێچکەی فەیلەسوفەکان کە عەقل بە سەر نەقل و دەقەکان زاڵ دەکەن و لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ڕەت کراوەتەوە و

[١٢] علم أصول الفقة نشأتة و تطوره، ل ٣٤



هەرچەندە هەندێ لە زانایانی کە سەر بە ئەهلی سوننەتن لەم بوارە کتێبیان داناوە و بە پێ ی لێکدانەوەی خۆیان بۆ بەرگری کردن لە شەرع و بەرپەرچدانەوەی متکلمین و فەلاسفە.

## سەرچاوەکانی زانستی أصول لای مەزهەبەکان

١. **سەرچاوەکانی مەزهەبی حەنەفی:**[١٣]

- **الفصول في الأصول** ی جەصاص ( أبوبكرأحمد بن على الرازى الجصاص ت٣٧٠ هـ)
- **تقويم أصول الفقة و تحديد أدلة الشرع ( تقويم الأدلة) للدبوسي** ( أبو زيد عبيدالله بن عمر الدبوسي، ت ٤٣٠ هـ)
- **كنز الوصول إلى معرفة الأصول للبزدوى** ( علي بن محمد الحسين بن عبدالكريم البزدوي ت ٤٨٢ هـ) کتابێکی کورتە
- **أصول السرخسي** ئیمامی سەرەخسی ( أبوبكر محمد بن أحمد بن أبي سهل السرخسي ت ٤٩٠ هـ).
- ميزان الأصول في نتائج العقول لعلاء الدين السمرقندي ت ٥٣٩ هـ کە گرنگترین کتابە لە زانستی ئوصول لە مەزهەبی حەنەفی بە شیوازی متکلمین دارێژراوە.

٢. **ئەو کتابانەی کە لە سەر رێچکەی ( جمهور) دانراون لەم بابەتە:**

- **التقريب و الإرشاد للباقلاني** ( أبوبكر محمد بن الطيب الباقلاني ت ٤٠٣ هـ)باقلانی ٣ کتابي هةية ( **الأصول الكبير، الأصول الأوسط و الأصول الصغير)** کە ئەمەی دواییان بەردەستە.
- العدة **في أصول الفقه لأبي يعلى الفراء** ( أبو يعلى محمد بن الحسين بن الفراء الحنبلي ت ٤٥٨ هـ)
- **إحكام الفصول في أحكام الأصول للباجي المالكي** ( أبو الوليد سليمان بن خلف الباجي ت ٤٧٤ هـ)
- **التبصرة في أصول الفقه و شرح اللمع لأبي إسحاق الشيرازى** ( أبو إسحاق إبراهيم بن علي الشيرازى الشافعي ت ٤٧٦ هـ)
- **البرهان لإمام الحرمين الجوينى** ( أبو المعالي عبدالملك بن عبدالله بن يوسف الجوينى ت ٤٧٨ هـ)
- **المستصفى من علم الأصول للغزالي** ( أبو حامد محمد بن محمد الغزالي ت ٥٠٥ هـ)
- **الواضح في أصول الفقه لإبن عقيل الحنبلي** ( أبو الوفاء علي بن عقيل بن محمد بن عقيل الحنبلي ت ٥١٣ هـ)
- **المحصول في علم أصول الفقه للرازى** ( فخرالدين محمد بن عمر بن الحسين الرازي ت ٦٠٦ هـ)
- **الإحكام في أصول الأحكام للأمدي** ( علي بن محمد الأمدي ت ٦٣١ هـ)

[١٣] علم أصول الفقه: مفهومه و نشأته و مناهجه و أهم مؤلفاته ، نعمان جغيم ل ٨

## کورتکراوەی زانستی ئۆصول

دیارە زانستی ئوصول زانستێکی بەرفراوانە و چەندین بەش و بابەت لە خۆ دەگرێت وەك حوکم و بە شەکانی کە بریتین لە حوکی تەکلیفی کە بریتین لە ٥ بەشە ناسراوەکان: واجب، مندوب، حرام، مکروە، مباح و هەندێ لە زانایان عەزیمە و روخصەشیان لە تەك ئەمانە باس کردووە.هەروەها حوکمی دانراو ( الحکم الوضعي) کە ٤ بەشە: سبب، شرط، مانع، الصحه و البطلان. دواتر لە بارەی حاکمیەت کە بابەتێکی ترە زانایان دابەشیان کردووە بۆ ٣ بەش حاکم ( کە الله یە جل جلاله) و محکوم فیە و محکوم علیە. دواتر دەربارەی ئەهلیەت و ئەو حالەتانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە کە هەندێکیان ئاسمانی و هەندێکیان (مکتسب) واتە بە دەست هێنراون وەك: نەزانین (جهل)، هەلە ( خطأ)، گاڵتە ( الهزل)، گێلی ( السفه)، سەرخۆشی ( السکر)، زۆرە ملێ کردن ( الإکراه). دواتر بەلگەی حوکمەکان کە بەشێکی سەرەکی زانستی ئوصول ە و بابەتی سەرەکی ئەم مەنزومەیە و مەبەستی ئێمە یە لەم نامیلکەیە کە سەرچاوەکانی بەلگە هێنانەوەی مەزهەبەکانە لە ( کتاب و سوننەت ، و کۆدەنگی ( إجماع)، و بەراوردکاری (قیاس)، و بە باش زانین ( إستحسان)، بەرژەوەندیە گشتیەکان ( المصالح المرسلة)، رێگرتن لە مەهانەکان ( سد الذرائع)، نەریت ( العرف)، ووتەی هاوەلان ( القول الصحابی)، شەریعەتی میللەتەکانی پێشوو ( شرع من قبلنا)، حوکمی پێشوو ( الإستصحاب) بە جیاوازی سەرچاوەکان لە نێوان مەزهەبەکان. هەروەها بابەتێکی تر بنچینە زمانەوانیە ئۆوصولیەکانە لە پێناو چۆنیەتی تێگەیشتن لە دەقەکان و دەستەواژەکان کە ئەویش چەند بەشێکە لە وانە: خاص و عام، مطلق و مقید، الأمر، النهی، الحقیقه و المجاز، الصریح و الکنایة، مفسر و محکم ظاهر و خفی، مشکل و مجمل و متشابە أقتضاء النص، دلالة النص، مفهوم المخالفة و هتد. دیارە هەندێ لە زانایانی هاوچەرخ هەندێ چەمکی تریشیان زیاد کردووە بۆ نێو کتێبە ئۆصولیەکان ئەویش: ئامانجەکانی شەریعەن ( مقاصد الشریعة). هاوکات باس کراوە لە چارەسەر کردنی هەبوونی جیاوازی لە نێوان سەرچاوەکان و دەقەکان و هەندێ بابەتی تریش باس کراوە وەك ( تعارض الأدلة و الترجیح و النسخ). و کۆتا بابەتیش کە دەکرێت بەشێك بێت لە زانستی ئۆصول مەسەلەی ئیجتیهاد و تەقلید و مەرجەکانیەتی.

# پۆلێن کردنی سەرچاوە شەرعیەکان

## لە ڕووی کۆدەنگی و ناکۆکی




## لە ڕووی نەقل و عەقل



# دەقی مەنزومە

## بسم الله الرحمن الرحيم

١. الحمد لله الذي قد فهمَا دلائلَ الشرعِ العزيزِ العلما
٢. ثم الصلاةُ والسلام أبداً على النبيّ الهاشمي أحمدا
٣. وآله الغرّ وصَحبهِ الكِرَامِ والتابعين لهُمُ علَى الدوَامِ
٤. وبَعدُ فالقَصدُ بذا النظمِ الوَجيز ذكر مَبَانِ الفِقْهِ في الشَرْعِ العَزِيز
٥. فقلتُ: واللهُ المُعينُ أستَعِين وأستمـدُ مِنْ فتحِهِ المُبين
٦. أدلةُ المَذهَبِ مَذهَب الأغرّ مَالكِ الإمَامِ سِتة عَشَر
٧. نص الكِتَابِ ثمَ نص السُنّة سُنةِ مَـنْ لهُ أتمَ المِنّة
٨. وظاهر الكتاب والظاهر من سنة من بالفضل كله قمِنْ
٩. ثم الدليل من كتاب الله دليـــل ســـنـة الأواه
١٠. ومن أصوله التي بها يقول تنبيه قرآنٍ وسنة الرسول
١١. وحجة لديه مفهوم الكتاب وسنة الهادي إلى نهج الصواب
١٢. ثمت تنبيه كتاب الله ثم تنبيه سنة الذ جاها عَظُمْ
١٣. ثمت إجماع وقيس وعمل مدينة الرسول أسخى من بذل
١٤. وقول صحبه والاستحسان هو اقتفاء ما له رجحان
١٥. وقيل بل هو دليل ينقذف في نفس من بالاجتهاد متصف
١٦. ولكن التعبير عنه يقصر به فلا يعلم كيف يخبر
١٧. وسد أبواب ذرائع الفساد فمالك له على ذاك اعتماد
١٨. وحجة لديه الاستصحاب ورأيه في ذاك لا يعاب
١٩. وخبر الواحد حجة لديه بعض فروع الفقه قد بني عليه
٢٠. وبالمصالح عنيت المرسله له احتجاج حفظته النقله
٢١. ورعي خلف كان طوراً يعمل وعنه كان طوراً يعدل
٢٢. وهل على مجتهد رعي الخلاف يجب أم لا فيه قد جرى اختلاف
٢٣. وهذه خمس قواعد ذكر فروع الفقه فيها تنحصر
٢٤. وهي اليقين حكمه لا يرفع بالشك بل حكم اليقين يتبع
٢٥. وضرر يزال والتيسير مع مشقة يدور حيثما يقع
٢٦. وكل ما العادة فيه تدخل من الأمور فهي فيه تعمل
٢٧. وللمقاصد الأمور تتبع وقيل ذي إلى اليقين ترجع
٢٨. وقيل للعرف وذي المقاصد خمستها لا خلف فيها وارد
٢٩. قد تم ما رمت ولله الحميد مني حمد دائم لا يبيد
٣٠. وأطيب الصلاة وأسنى السلام على محمد وآله الكرام

# شیکردنەوەی مەنزومە

**بەیتی یەکەم**

**الحمد لله الذي قد فهّما دلائلَ الشرعِ العزيزِ العلما**

دوای (بەسمەلە) زانایان بە ستایش کردنی خوای تعالی ووتار و نوسینەکانیان دەست پێ دەکەن وەك شوێن کەوتنی رسول الله صل الله علیه و سلم. دانەر سوپاسی خوای تعالی دەکات کە بنچینە و بنەماکانی شەریعەتی خۆشەویستی بە ئێمە پێشان داوە و ڕوونی کردووە. ( تفهیم: واتای تعلیم واتە فێر کردن دەگەیێنێت) و ( دلائل الشرع: واتای بنچینە و بنەماکانی گشتی شەریعەتە).

**بەیتی دووەم و سێیەم**

**ثم الصلاةُ والسلام أبـــدا على النبيِّ الهاشمي أحمدا**
**وآله الغُرِّ وصَحبِهِ الكِرَامْ والتّابعين لهُمْ عَلَى الدّوَام**

دوای ستایش و سوپاسی خوای تعالی زانایان سەلاوات لێ دەدەن لە سەر پێغەمبەری خوای تعالی صل الله علیه و سلم و لێرە دانەر سەلات و سەلام لێ دەدا لە سەر پێغەمبەری خوای تعالی صل الله علیه و سلم، لە سەر ناوی (ئەحمەد) کە یەکێکە لە ناوەکانی پیغەمبەرمان صل الله علیه و سلم، کە لە قورئان دا هاتووە، و هەروەها بە نەسەبەکەی کە هاشمیە، هەروەها ئال و بەیتەکەی و هاوەڵانی بەڕێز ڕەزای خوایان لێ بێت و ئەوانەش کە شوێنیان کەوتن تا ڕۆژی کۆتایی. و الأغر: (غر) لە دەم و چاوی سپی هاتووە کینایەت بۆ ئیمان و پاکی ئال و بەیتی صل الله علیه و سلم .

**بەیتی چوارەم**

**وبَعدُ فالقَصْدُ بذا النّظم الوَجيز ذكر مَبَانِ الفِقْهِ في الشّرْعِ العَزِيز**

و ( **بعد**) واتە دوای سوپاس و ستایش و صلاوات لێدان ( **فالقصد**) واتە مەبەست ( **بذا النظم الوجيز**) لەم پارچە شیعرە کورت وپوختە کە واتای زۆرە و دەربڕینی کەمە (**ذكر مباني الفقة**) واتە باس کردنی بنچینەکانی گشتی زانستی فیقە لە شەرعی خوای تعالی. و **فیقە**: لە زمانەوانی واتە تێگەیشتن و لە ڕووی زاراوە واتە: زانینی حوکمە شەرعیەکانی کردەیی کە لەو بەڵگانە وەردەگیرێن کە بە تێر وتەسەلی ڕونیان دەکەنەوە. و پێناسەی فیقهیش پیویستی بە ڕاڤە کردن

هەیە. حوكمە شەرعیەكان: حوكم واتە شتێك بدەیتە پاڵ شتێكی تر بە ئەرێنی یا نەرێنی، شەرعی یەكان واتە ئەو حوكمانەی كە لە شەریعەتە وە وەردەگیرێن بە ڕاشكاوی یا بە هۆی تێگەیشتن بۆیە حوكمە عەقلیەكان لێ ی دەردەچێت وەك ئەوەی بلێ ی، نیوەی دووە دەبێتە یەك، هەروەها حوكمە ئاساییەكانیش ی لێ ی دەردچێت وەك ئەوەی دەزانین ئاگر دەسوتێنێت. هەروەها كردەیی: واتە دەبێت حوكمەكە پەیوەست بێت بە چۆنیەتی كارێكی قەلبی وەك زانینی واجب بوونی نیەت لە دەست نوێژ، یا لە كردەوە وەك سونەت بوونی ویتر بۆیە حوكمە كانی بیروباوەڕی لێ دەردەچێت كە پەیوەندی بە چۆنیەتی كردەوە نیە وەك زانینی ئەوەی كە الله سبحانە و تعالی تاك و تەنیایە و تەواو و بێ نوقصانیە بۆیە ئەمە نابێتە فیقە. و بەلگە تیروتەسەلەكان: واتە ئایەتەكانی قورئان و فەرمودەكانی پیغەمبەرمان صل الله علیە و سلم، بۆیە زانستی ئەوانە ی كە تەقلید دەكەن وەك زۆربەی زانایانی سەردەم نابێتە فیقە بەلكو دەبیتە گواستنەوە و ریوایەت كردنی مەزهەبی گەورە زانایانی پێش خۆیان. [١٤]

## بەیتی پێنجەم

فقلتُ: واللهُ المُعينُ أستعِين وأستمـدّ مِنْ فتحِهِ المُبين

دانەر دەڵێت: تەنیا پشت بە الله دەبەستم و داوای سەرخستن و سەركەوتن تەنیا لەوی دەكەم.

## بەیتی شەشەم

أدلّةُ المَذهَبِ مَذهَبِ الأغَر مَالِكِ الإمَام سِتّة عَشَر

دانەر دەڵێت: بەلگەكانی مەزهەب ( مەبەست لێرە لە بەلگە) واتە بنەما بنچینەییە گشتیەكانی مەزهەبی ئیمامی مالیكە ڕەحمەتی الله ی لێ بێت كە مەزهەب لە كار پێكردن و فەتوا دان و دادوەری و قەزاوەت پشتیان پێ دەبەستێت شانزە بنەمایە كە لەم مەنزومەیە لە ٣٠ بەیت دا ئاماژەیان پێدراوە.

## بە یتی حەوتەم

نص الكِتابِ ثمّ نص السّنّة سُنةِ مَـنْ لَهُ أتمّ المِنّة

---

[١٤] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ٧.

**سەرچاوەی یەكەم لای ئیمامی مالیك بریتیە لە ( نص الكتاب) لە هەندێ شوێن بە (فهم الكتاب) هاتووە بەلام ڕەنگە (نص ) دروست تر بێت.**

واتە دانەر لێرە لەم بەیتە بە دواوە باس لەو شانزە بنەما سەرەكیەی زانستی ئوصول دەكات لە مەزهەبی ئیمامی مالیك. و هەروەك لە سەرتاش ئاماژەمان پێدا سەرچاوەیەكی وامان لە بەر دەست نیە كە ئیمامی مالیك بە ڕاشكاوی ئەم شانزە بنەمایە ی باس كردبێت بەلكو ئیمامی مالیك و سەر مەزهەبەكانی تریش بنەما ئۆصولیە كارپێكراوەكان لای ئەوان لە لایەن زانایانەوە بە پێ ی خوێندنەوە (إستقراء) ئەم بنەمایانەیان لە فەتوا و ئیجتیهادەكانیان هەلێنجاوە و داڕشتۆتەوە.

یەكەم بنەما ( **نص الكتاب**) واتە دەقی قورئانی پیرۆزە و (**نص**) ئەو دەستەواژەیە كە واتایەك بگەیێنێت كە جگە لەم واتایە، واتای تر لە خۆ نەگرێت. وەك ڕۆژوو گرتنی ئەو كەسەی كە حەجی تمتع ی كردووە و نەیتوانیوە قوربانی بكات.

" **فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ**" البقره ١٩٦، بۆیە ئەم دەقە لە قورئان سەبارەت بەو كەسەی حەجی تمتع دەكات و توانای قوربانی كردنی نیە دابەزیوە كە دەبێت دە ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت سێ ڕۆژ هەر لە كاتی حەج و حەوت ڕۆژ دوای گەرانەوە بۆ ئەوەی دە ڕۆژەكە پڕ بكات.

و لە دوای دەقی قورئان (**نص السنة**) واتە دەقی فەرمودەیە وەك ئەم فەرمودەیە سەبارەت بە قەدەغە كردنی زیندە بە چاڵ كردنی كچەكانە كە لە سەردەمی نەفامی ئەنجام دراوە (**إنَّ اللهَ عزّ وجلّ حَرَّمَ عليْكُم: عُقُوقَ الأمَّهاتِ، ووأْدَ البَنَاتِ،...**) صحيح مسلم ٥٩٣.[١٥]

**بەیتی هەشتەم**

**وظاهر الكتاب والظاهر من سنة من بالفضل كله قمِنْ**

**سەرچاوەی دووەم لە بنەما سەرەكی و بنچینەییەكانی مەزهەبی ئیمامی مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێت بریتیە لە (ظاهر الكتاب و ظاهر السنة)**

و(**ظاهر**) بریتیە لە دەستەواژەیەك كە لەو شوێنەی هاتۆتە دەربڕین مانایەك دەگەیێنێت بەلام لەوانەیە واتای تریشی هەبێت كە لێرە مەبەست نەبێت بۆیە واتای كە مەبەستە بە ( **ظاهر**) دادەنرێت و مانای تر كە مەبەست نیە بە (تأويل ) دادەنرێت.

نموونەی (**ظاهر**) واتە ڕووكەش لە دەقێك دا: قوله تعالى " **فإطعام ستين مسكينا**" واتە كەسێك نەیتوانی دوو مانگ بە ڕۆژوو بێت ئەوا لە سەریەتی شەست كەسی هەژار تێر بكات و خواردنیان پێ بدات. و نمونەش لە سوننەت: (وەك لە سنن ی ئەبو داوود هاتووە: (**من لم يبيت الصيام من الليل فلا صيام له**)، واتە مانای ڕوو كەشی ئەم فەرمودەیە ئەوەیە كە نیەتی ڕۆژوو هینان لە سەرە شەو واجبە بۆ ڕۆژوو گرتن، و لە وانەیە مەبەست لێ ی هەندێ لە ڕۆژووەكان بێت وەك ڕۆژووی نەزر و ڕۆژووی قەزاكردنەوە و جگە لە و دوانە ڕۆژووەكانی تر بە بێ نیەت هینان لە سەرەشەو دروست

---

[١٥] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ٧

بێت و خوێندنەوەی یەكەم واتە بۆ هەموو رۆژووەكان مەزهەبی زۆرینەیە واتە **(جمهور)** و ڕای دووەم مەزهەبی ( **حەنەفیە)**.

وبنەمای شەرعی سەرخستنی مانای ڕۆوكەشە بە سەر تأویل لای هەموو زانایان تەنیا گەر لەو حالەتە نەبێت كە تأویل بە هۆی بەلگەیەكی تر لە شەریعەت پاڵپشتی بۆ بكرێت. هەروەها نموونەیەكی تر كە پێغەمبەرمان صل الله علیە و سلم دەفەرموێت: ( **لا صلاة لجار المسجد إلا في المسجد)**، ئەوا لە ڕۆكەش ئەوا نەفی كردنی دروست بوونی نوێژی جیرانی مزگەوتە گەر لە مالی خۆی بە تەنیا نوێژ بكات و هەروەها ئەفەرمویت صل الله علیە و سلم ( **صلاة الجماعة تفضل صلاة الفذ بسبع و عشرين درجة)** و ووشەی ( **تفضل)** واتای ئەوە دەگەینێت كە نوێژی كەسێك بە تەنیا دروستە هەر چەندە نوێژی جەماعەت فەزل و پاداشتەكەی زیاترە.[16]

هەروەها **(ظاهر)** واتە مانای ڕووكەش ئەمر و نەهی و عام و خاص و مطلق واتە ڕەها لە خۆ دەگرێت.

شێوەكانی خوێندنەوەی دەستە واژە بە مانا ڕۆكەشەكەی ئەمانەیە:[17]

١. ( **الإنفراد في الوضع)** واتە لە دانان ماناكەی تەنیا بۆ ئەو دانرابێت و پێچەوانەكەشی ( **إشراك)** ە واتە مانای تری هاوبەش هەبێت و زانا ئۆصۆلیەكان ووتویانە كە ( **الإشراك خلاف الأصل)** واتە مانای هاوبەش هەبوون پێچەوانەی بنچینەیە. وەك قوله تعالی: ( **و لا تنكحوا ما نكح اباؤكم من النساء)** النساء ٢٢. هەندێ لە ئۆصولیەكان ووشەی **(النكاح)** یان بە مانای ( **ضم)** خوێندۆتەوە واتە لە خۆ گرتن كە مانایەكی ڕاستەقینەیە و مانای گرێبەست و جووت بوون یش دەگەینێت.

٢. **(التباين)** واتە جیاواز بوون و پێچەوانەكەشی ( **الترادف)** ە و واتە هاو واتا بوون. و بنچینە و ئەسل لە دەستە واژەكان جیاواز بوونە نەوەك هاومانابوون. وەك لە فەرمودە كاتێك صل الله علیە و سلم دەفەرموێت: ( **ليلني منكم أولوا الأحلام و النهى)**، واتە لە دوای من بوەستن ( **واتە بۆ نوێژ)** ئەوانەی ژیر و زانان و هەندیكیش ( **أولو الأحلام)** یان بە كەسی بالغ مانا كردووە. لە بەر ئەوەی ئەم ووشەیە ( **أولو الأحلام)** مانای جیاوازی هەیە ئەوا لە سەر جیاوازیەكەی مانا دەكرێت.

٣. **(التأسيس)** واتە دامەزراندن و پیچەوانەكەشی ( **تأكيد)** واتە دووبارە كردنەوە. بۆیە كاتێك ووشەیەك هات لە بنچینەدا بە مانایەكی نوێ وەردەگیرێت نەوەك دووپات كردنەوەی مانایەكی پێشووتر. وەك لە سورەتی ( **الرحمن)** دووبارە كردنەوەی ( **فبأي الاء ربكما تكذبان)** لە بەر ئەوەی لە سەرەتای سورەت تا كۆتایی دووبارە بۆتەوە بە مانای ڕەت كردنەوەی سەرەتاوە دێت نەوەك دوپات كردنەوەی ماناكەی لە هەر شوێنێك لە بەر ئەوەی عەرەب بۆ دوپات كردنەوە لە ٣ جار زیاتر شتێك دووبارە ناكەنەوە.

٤. **(الترتيب)** واتە بە دوای یەك هاتن و بەرامبەرەكەشی ( **تقديم و تاخير)** ە، لە مەزهەبی مالكی ئەوانەی كە **(ظهار)** دەكەن واتە پشت لە خێزانەكانیان دەكەن ئەوا ( **عود)** واتە پەشیمان بوونەوە و چوونە لای خێزانەكانیان بە مەرج دادەنین بۆ واجب بوونی كەفارەت بە پشت بە ستن بە قوله تعالی: " **و الذين يظاهرون من نسائهم ثم يعودون لما قالوا فتحرير رقبة من قبل أن يتماسا"** المجادله ٣.

---

[16] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ٨

[17] شیكردنەوەی مەنزومەی ابن أبی كف، ئەبو ماریە تەمیمی، مكتبە شاميلە ل ٢٢

٥. **(العموم** )و بەرامبەرەكەی ( **خصوص)** ە . و لە بنچینەدا ئەسل بریتیە لە مانەوە لە سەر عموم واتە مانا گشتیەكەیە تا ئەو كاتەی بەڵگە لە سەر تخصیص واتەتایبەت كردن هەبێت. وەك بۆچوونی هەندێ لە زانایان سەبارەت بە مانای ( **أنعام )** لە و ئایەتە: " **أحلت لكم بهيمة الأنعام"** المائدە ١. و بە گشتیان وەرگرتووە كە هەرچی مانای ئاژەڵی هەبێت حەلالە بە بێچووەكەی ناو زگیشیان و پێویستی بە سەربڕینیان ناكات و بە سەربڕینی دایكەكە بێچووی ناو زگیشی حەلال دەبێت بە بەڵگەی ئەوەی كە لای عەرەب هەموویانی هەر بە **(بهائم)** واتە ئاژەل دادەنێت لە ڕووی زمان و ناونانیان.

٦. **(الإطلاق)** و بەرامبەرەكەشی ( **تقييد)** ە. بۆیە گەر ئاراستە كردنەكە ڕەها بوو هیچ سنووردار كردنێكیشی بۆ نەبوو ئەوا ماناكەی بە ڕەهایی وەردەگیرێت. وەك بۆچوونی مالكیەكان بۆ ئایەتی: " **لئن أشركت ليحبطن عملك"** الزمر ٦٥. واتە گەر هاوبەشت دانا بۆ الله تعالى ئەوا هەموو كردەوەكانت مایە پوچ دەبێت. بۆیە لای مالكیەكان بە ڕەهایی وەرگیراوە و تەنیا هەڵگەڕانەوە دەبێتە هۆی مایە پوچ بوونی هەموو كردەوەكان ئەوجا ئەو كەسەی هەڵگەڕاوەتەوە لە سەر ئەوە بمرێت یا جارێكی تر بهێتەوە نێو ئیسلام.

٧. ئەمر كردن بە ڕهایی بە مانای واجب بون دێت تەنیا لە كاتێك نەبێت كە شتێك لە وجوب بگۆڕێت بۆ ندب واتە مستحب وەك قوله تعالى: " **و لا يغتب بعضكم بعضا"** الحجرات ١٢.

**بەیتی نۆیەم**

**ثمَّ الدليل من كتابِ اللهِ ثمَّ دليلُ سنةِ الأواهِ**

## سەرچاوەی سێیەم لە بنچینەكانی مەزهەبی ئیمامی مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێت بریتیە لە (دلیل الخطاب) لە كتاب و سوننەت

وەك دانەری مەنزومە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەم بەیتە ئاماژەی پێداوە. ئەم سەرچاوەیە لە لایەن شافعیش ڕەحمەتی خوای لێ بێت جێگای بەڵگە پێ هێنانەوەیە بەلام ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێت ڕەتی دەكاتەوە. **(دلیل الخطاب)** بریتیە لە هەمان **(مفهوم المخالفة)** واتە تێگەیشتنی پێچەوانە كەی.

**مفهوم المخالفة**: بریتیە لە وەی بابەتێك حوكمی لە سەر هاتووە بەلام لە سەر بابەتەكەی تر بێ دەنگ بووە ئەوا بە پێچەوانەی حوكمی لە سەر بدرێت. بە واتیەكی تر چەسپاندنی پێچەوانەی ئەوەی حوكمی لە ەر دەربڕیوە بە ئەرێنی یا نەرێنی بۆ ئەمەی كە بێ دەنگی لە سەرە لە كاتێك كە لە كەلامەكە هیچ تایبەتمەند كردنێك بوونی نەبێت. و بۆیە بە ( **دليل الخطاب)** ناو نراوە لە بەر ئەوەی بەڵگەكەی لە ڕەگەزی حوكمە ئاراستە كراوەكەیە یا خود خیتابەكە بەڵگەیە لە سەری[١٨]. ئەم بنچینەیە لە سەر مەرج ( **شرط)**، ئامانج ( **غاية)**، قۆرخ كردن ( **حصر)**، ژمارە، هۆكار ( **علة)** و ئاكار **(وصف)** و هەلومەرج ( **ظرف)** یش جێ بە جێ دەبێت.

واتای **مەرج**: دەلالەت كردنی دەستە واژەی دەقەكە لە سەر چەسپاندنی پێچەوانەی ئەوەی حوكمی لە سەر هاتۆتە دەربڕین بە مەرج سنووردار كراوە لە سەر ئەوەی بێ دەنگی لە سەرە لە كاتی نەبوونی ئەم مەرجە.

---

[١٨] تقريب و تهذيب إيصال السالك في أصول الإمام مالك، أستاذ لكريم امصنصف، ل ١٨

واتای **ئامانج**: دەلالەت کردنی دەستە واژەی دەقەکە لە سەر چەسپاندنی پێچەوانەی ئەوەی حوکمی لە سەر هاتۆتە دەربڕین بە ئامانج سنووردار کراوە لە سەر ئەوەی بێ دەنگی لە سەرە لە کاتی نەبوونی ئەم ئامانجە.

واتای **قۆرخ کردن** ( حصر) : دەلالەت کردنی دەستە واژەی دەقەکە لە سەر چەسپاندنی پێچەوانەی ئەوەی حوکمی لە سەر هاتۆتە دەربڕین بە حصر سنووردار کراوە لە سەر ئەوەی بێ دەنگی لە سەرە لە کاتی نەبوونی ئەم حصر ە.

واتای **ژمارە**: دەلالەت کردنی دەستە واژەی دەقەکە لە سەر چەسپاندنی پێچەوانەی ئەوەی حوکمی لە سەر هاتۆتە دەربڕین بە ژمارە سنووردار کراوە لە سەر ئەوەی بێ دەنگی لە سەرە لە کاتی نەبوونی ئەم ژمارەیە.

نەهی کردن بە ڕەهایی مانای حەرام کردن دەگەیەنێت. گەر هیچ شتێك نەبوو ماناکەی لە ڕەهایی یەوە بگۆڕێت و سنوورداری بکات و بیگۆڕیت بۆ واتای هۆکار: دەلالەت کردنی دەستە واژەی دەقەکە لە سەر چەسپاندنی پێچەوانەی ئەوەی حوکمی لە سەر هاتۆتە دەربڕین بە هۆکار سنووردار کراوە لە سەر ئەوەی بێ دەنگی لە سەرە لە کاتی نەبوونی ئەم هۆکارە.

واتای **ئاکار** ( وصف) : دەلالەت کردنی دەستە واژەی دەقەکە لە سەر چەسپاندنی پێچەوانەی ئەوەی حوکمی لە سەر هاتۆتە دەربڕین بە ئاکار سنووردار کراوە لە سەر ئەوەی بێ دەنگی لە سەرە لە کاتی نەبوونی ئەم ئاکارە.

واتای **هەلومەرج** ( کات و شوێن) : دەلالەت کردنی دەستە واژەی دەقەکە لە سەر چەسپاندنی پێچەوانەی ئەوەی حوکمی لە سەر هاتۆتە دەربڕین بە هەلومەرج سنووردار کراوە لە سەر ئەوەی بێ دەنگی لە سەرە لە کاتی نەبوونی ئەم هەلومەرجە لە ڕووی کات یا شوێن.

**دليل الخطاب** یا هەمان واتای پێچەوانە جێگای بەلگە پێ هێنانەوەی شەرعیە بە مەرجێك بەربەستی شەرعی بوونی نەبێت. بەربەستەکانیش شەش دانەیە:

١. گە رهاتو ئەم سنووردارکردنە ( قید) ە کە هەمان مەرج، ئاکار، و سنووردارکردنەکانی ترە کە بەلگەی خیتابەکەی لە سەر دەوەستێت بۆ دەربڕینی زۆرینە بێت نەوەك سنووردار کردن.
٢. یا خود هێنانەوەی سنوردار کردنەکە لە پێناو سوپاسگوزاری بێت نەك سنوردارکردن.
٣. یاخود سنوردار کردنەکە بۆ دوپات کردنەوە و جەخت کردنەوە بێت.
٤. یا خود لە پێناو دەربڕینی ڕاستیەکە بێت.
٥. یا خود بۆ زیادە ڕۆیی لە ئاکار بیت واتە ( المبالغة)
٦. یا خود مەبەست لە سنوردار کردنەوە لە پێناو پرسیاری ئەو کەسە بێت کە پرسیاری لێوە کردووە.

نمونە لە ئامانج (الغاية) لە کتابی خوای تعالى دەربارەی ئەو ئافرەتانەی سێ بە سێ تەلاق دراون: " **فإن طلقها فلا تحل له حتى تنكح زوجا غيره**" واتە گەر سێ بە سێ تەلاقی دا ئەوا ناتوانێت دوبارە مارەی بکاتەوە هەتاوەکو کەسێکی تر مارەی بکات و تەلاقی بدات ئێنجا بۆ مێردی پێشوو حەلال دەبێتەوە.

نموونە بۆ ( عدد) " **الزانية و الزاني فاجلدوا كل واحد منهما مائة جلدة**" واتە ئەوەی زینا بکات لە ڕەگەزی مێ و ڕەگەزی نێر ( و هاوسەردار نەبن) ئەوا ١٠٠ قامچیان لێ بدەن و ووشەی ١٠٠ واتە سنووردارە بە م ژمارەیە و ناکرێت کەمتر و زیاتر لێ بدرێت.

نموونە بۆ ( **الحصر)** " **لا یكلف الله نفسا إلا وسعها**" واتە الله تعالی هیچ نەفسێك ئەركدار ناكات تەنیا لە سنووری توانا و تاقەتی خۆی نەبێت واتە تەكلیف سنوردار كراوە بە تاقەت و توانای خاوەنەكەی. و لە سوننەت ( **لا یقبل الله صلاة بغیر طهور)** واتە خوای تعالی نوێژ بە بێ دەست نوێژ قبول ناكات واتە قبول بوونی نوێژ بەندە لە سەر هەلگرتنی دەستنوێژ.

نموونە بۆ ئاكار ( **صفة)**: " و **ربائبكم اللاتي في حجوركم من نسائكم الاتي دخلتم بهن**" واتە ئەو كچانەی لە ناو مالەكانتان لای ئێوە بە خێو دەكرێن و منالی ئەو خێزانانەتانن كە لە گەلیان جووت بوون و لێرە خێزانەكان بە و ئاكارە سنووردار دەكرێن كە پیاوەكانیان چوونەتە لایان.

نموونەی هەلومەرج **(ظرف)**: " **الحج أشهر معلومات**" و " **أنتم عاكفون في المساجد**" یەكەم لە ڕووی كات و دووەمیان لە ڕووی شوێن سنووردار كراوە و حەج جگە لە مانگە دیاریكراوەكان دروست نیە و اعتكاف كردنیش جگە لە ناو مزگەوتەكان لە شوێنی تر دروست نیە.

نموونە بۆ جەخت كردنەوە ( **تأكید)**: " **لا یحل لأمرأة تؤمن بالله و الیوم الأخر أن تحد علی میت إلا علی زوجها أربعة أشهر و عشرا**" واتە دروست نیە ئافرەتێك كە بڕوای بە الله تعالی و ڕۆژی دوایی هەبێت زیاتر لە سێ ڕۆژ ماتەم بگێڕێت تەنیا بۆ پیاوەكەی نەبێت كە ماوەی چوار مانگ و دە ڕۆژە. لێرە بڕوا هەبوون بە خوای تعالی و ڕۆژی كۆتایی بە ( **قید)** دانەنراوە بۆ جێ بە جێ كردنی ئەم فەرمانە بەلكو بۆ جەخت كردنەوەیە ئەگینا ئافرەتی ئەهلی كتابیش دەبێ وەك ئافرەتی موسلمان بۆ مێردە موسلمانەكەی چوار مانگ و دە ڕۆژ ماتەم دار بێت و خۆی بپارێزێت لە خۆڕازاندنەوە بۆ شوو كردن.

نموونەش بۆ دەرخستنی ڕاستیەكە: " **لا یتخذ المؤمنون الكافرین أولیاء من دون المؤمنین**" واتە بڕوادارەكان بۆیان نیە جگە لە بڕواداران خەلكی كافر بكەن بە دۆست و هاوەلی خۆیان. بۆیە من دون المؤمنین بۆ دەربڕینی واقیعەكەیە نەوەك بۆ ڕێگە پێدان بە ویلایەتی كافران.

نموونە بۆ ( **المبالغه)**: " **إن تستغفر لهم سبعین مرة فلن یغفر الله لهم**" واتە گەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبونیان بۆ بكەی ئەوا هەر خوای تعالی لێیان خۆش نابێت. و لێرە مانای ئەوە نیە گەر زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆش بونیان بۆ بكات خوای تعالی لێیان خۆش دەبێت بەلكو ژمارەی حەفتا بۆ موبالەغەیە واتە هەرچەندە زۆر داوای لێخۆش بونیش بكەیت هەر خوای تعالی لێیان خۆش نابێت.

**نموونە بۆ هێنانەوە لە پێناو پرسیاری پرسیار كەر**: وەك فەرمودەی رسول الله صل الله علیه و سلم: ( **في الغنم السائمة زكاة)**: لێرە مەڕ سنوردار كراوە بە و مەڕەی كە زۆربەی سالٍ لە لەوەڕگای سروشتی دەلەوەڕێت و عەلەفی پێ نادرێت. لێرە لای مەزهەبەكان خیلافی لە سەر هەیە، لە مەزهەبی شافیعی گەر هەموو سال بە سروشتی بلەوەڕێت تەنیا گەر زۆر كەم عەلەفی پێ بدرێت ئەگینا زەكاتی لێ ناكەوێت بەلام لە مەزهەبی حەنبەلی و حەنەفی، لای ئەوان گەر زۆربەی سال بە سروشتی بلەوەڕێت ئەوا زەكاتی لێ دەكەوێت و گەر نیوەی سالٍ زیاتر عەلەفی پێ بدرێت ئەوا زەكاتی لێ ناكەوێت بەلام لە مەزهەبی مالیكی ئەوا بە هەر حالٍ زەكاتی لێ دەكەوێت چ عەلەفی پێ بدرێت یا نە و لای مالیكیەكان ئەم سنووردارکردنە بە سائمە تەنیا بۆ وولامی پرسیار كەرە كەیە تا بزانێت كە مەڕی سائمە زەكاتی لێ دەكەوێت و لای ئەوان بە قید و سنوردار كردن نازانرێت.

**بەیتی دەیەم**

**ومِن أصوله التي بها يقولْ .. تنبيهُ قرآنٍ وسنةِ الرسولْ**

## سەرچاوەی چوارەم بەلگەهێنانەوەیە لە مەزهەبی ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای تعالای لێ بێت

## بریتیە لە ( تنبیه الخطاب)

واتە سرنجی خیتاب لە قورئان و لە سوننەت بە ناوی ( **فحوى الخطاب**) و ( **مفهوم الموافقة**) ش ناودەبرێت لای زانایانی ئۆصول. و بۆیە بە (**مفهوم الموافقه**) ناودەبرێت لە بەر ئەوەی ئەوەی بێ دەنگی لێكراوە لە گەل مانای ئەوەی حوكمەكەی باس كراوە لە حوكم یەك دەگرنەوە و لە یەك دەچن. و بۆیە بە ( **تنبیه الخطاب** )ناوبراوە لە بەر ئەوەی گوێگر كاتێك خیتابەكەی ئاراستە دەكرێت بە هۆی مانای حوكمی دەربڕاوەكە سرنج دەدات و حوكمی ئەو شتەی كە بێ دەنگی لێ كراوە هەمان حوكمی هەیە و حوكمیان لێك دەچن.

نموونە لە قورئان: " **و لا تقل لهما أف**" واتە نابێت بە دایك و باوت بلێ ی ئۆف! و پەكسەر لە مانای ئەم ئایەتە دەخوێنیتەوە گەر دروست نەبێت بە دایك و باوك بلێیت ئۆف! ئەوا هەر ناكرێت زیاتر لەمەی پێ بووترێت لە قسەی ناخۆش و جنێو لێدان و ئازاردان. و لە سوننەت: فەرمودەی رسول الله صل الله علیه و سلم لە صحیح ی بوخاری: **( لو دعيت إلى كراع لأجبت، و لو أهدي إلى كراع لقبلته)**، واتە گەر بانگهێشت بكرێم بۆ داوەتی خوانێك بە ئێسكە گۆشتێك ئەوا قبولی دەكەم و گەر ئیسقانە گۆشتێكم بە دیاری پێ بدرێت وەری دەگرم. واتای ئەوەیە گەر بە شتێكی كەم داوەت كرای سونەتە قبولی بكەی گەر نرخی زۆر بێت و گرانبەها تر بێت لە ئیسقانە گۆشتێكی بێ نرخ ئەوا ئەولا ترە كە قبولی بكەیت.

لە جمع الجوامع هاتووە: ئیمامی شافعی و ئیمامی حەرەمەین و ئیمامی رازی رەحمەتی خوا لە هەموویان بێت ( **تنبیه الخطاب**) بە ( **قیاس جلی**) دەزانن و لای ئەوان دەلالەتی دەستە واژەكە ڕوونە بۆیە پێویست بە قیاس ناكات و لە سەر چۆنیەتی دەربڕین جیاوازیان هەیە. [19]

[19] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ١٢

### بەیتی یانزەهەم

**وحجة لديه مفهوم الكتاب .. وسنة الهادي إلى نهج الصواب**

**سەر چاوەی پێنجەم لە بنچینەکانی ئیمامی مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێت ( مفهوم الخطاب) ە واتە تێگەیشتنی خیتاب.**

مفهوم واتە تێگەیشتن بریتیە لە دەربڕینی خوازراو ( **الإقتضاء**) کە ئەمەش دوو جۆرە: ڕاشکاوانە ( **تصريحي**) و ئاماژە پێدان (**تلويحي**).

- خوازراوی ڕاشکاوانە ( **الإقتضاء التصريحي**): بریتیە لە مانایەکی خوازراو کە ئامانجی قسەکەرە و ڕاستی و دروستی ئەم ووتەیە لە ڕووی نەریت و عەقل و شەرعە وە لە سەری دەوەستێت و لە بنچینەدا ئەم دەستە واژەیە بە تەنیا ئەم مانایە نابەخشێت بەلکو وا پێویست دەکات کە ئەم مانایە ببەخشێت. و ئەم مانایاە پیوێستی بە هەبوونی (**تقدير محذوف**) هەیە بۆ ئەوەی ئەو مانا خوازراوە بەخشێت کە خاوەن قسە مەبەستیەتی. بۆ نمونە: قوله تعالی: " **حرمت عليكم أمهاتكم**" واتە دایەکەکانتان لێتان حەرام کراوە لێرە مەبەست لێ ی مارەکردنە نەوەك حەرام بوون خۆی لە خۆیدا.. هەروەها قوله تعالی: " **و اسال القرية التي كنا فيها**" واتە لەو گوندەی ئێمەی تیایدا بووین بپرسە مەبەست لە خەلکی گوندەکەیە.[20]
- خوازراوی ئاماژە پێدراو( **الإقتضاء التلويحي**): ئەمەیان بریتیە لە دربرینی دەستەواژە لە سەر مانایەك کە لە مانا سەرەکیەکە وەردەگیرێت بەلام ڕاستی و دروستیەکەی لە ڕووی شەرع و عەقل و نەریت پێوە بەند نیە. نموونەش بۆ ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە قورئان: " **و حمله و فصاله ثلاثون شهرا**" لە گەل ئەم ئایەتە " **و فصاله في عامين**" بە بێ ئەوەی بە ڕاشکاوی هاتبێت لە کۆی ئەم دوو ئایەتە کەمترین ماوەی (حمل) دەزانرێت کە ئەویش (٦ مانگە).

حوکمی ئەم جۆرە تێگەیشتنە وەك سەرەخسی دەلێت وەك تێگەیشتنە لە دەق وەك زانایان ووتویانە: ( **و المقتضى كالملفوظ**) بەلام گەر ئەمانە پیچەوانەی یەکتر بوون ئەوا دەقەکە لە پێشترە. [21]

و سەرەخسی دەلێت ( **مقتضى**) صیفەتی عموم ی نیە بەلام شافیعی دەلێت وەك دەقەکان صیفەتی عموم ی هەیە.

و عموم واتە کۆی ( عام) ە و عام یش چەند جۆری هەیە لە وانە: عام المجموعي و العام الإستغراقي و عام کە مەبەستی گشتی بیت و عام کە مەبەستی خصوص بێت. لە پێناو کورت بڕی، زیادتر ناچینە نێو ووردەکاریەوە.

---

[20] ثلاثون مثالا على دلالة الإقتضاء، د. ربيع أحمد، موقع الألوكة https://www.alukah.net/sharia/0/73903/

[21] شیکردنەوەی مەنزومەی ابن أبی کف، ئەبو ماریە تەمیمی، مکتبە شامیلە ل ٣٦

**بەیتی دوانزەیەم**

**ثمت تنبيه كتاب الله ثم تنبيه سنة الذ جاهاً عَظُمْ**

**سەرچاوەی شەشەم لە بنچینەكانی ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێ بێت ( تنبيه الكتاب و السنة) یە كە بە (تنبيه الخطاب) و هەروەها بە ( دلالة الإيماء) یش ناسراوە.**

و بریتیە لە ئاكاریك كە بكەوێتە پاڵ حوكمێك و گەر ئەم ئاكارە ( وصف) ە نەبوایە و نەخرابوایە پاڵ ئەم حوكمە لە پێناو خستنە ڕووی هۆكار ( علە) ی حوكمە كە ئەوا مەبەست و ئامانجی گوفتارەكە وون بوایە و ئەمەش شایستە نیە بۆ ڕەوانبێژی.

نموونە لە كتاب: قوله تعالى: " **و السارق و السارقة فاقطعوا أيديهما**" لێرە ئەمر كردن بە دەست بڕینی پیاو و ئافرەتێك كە دزیان دراوەتە پاڵ بێگومان وای لێ دەخوێنرێتەوە كە دزی هۆكاری شەرعی دەست بڕینەكەیە بۆیە گەر هۆكارەكە نەبوایە ئەوا گوفتارەكە واتای نەدەگەیاند.[٢٢]

نموونەش لە سوننەت: فەرمودەی رسول الله صل الله عليه و سلم كاتێك بەو ئەعرابیەی كە ووتی لە ڕۆژی رەمەزان لە گەل خێزانی جووت بووە، دەفەرموێت: **إعتق رقبة** .... هتد. بۆیە ئەمركردنی صل الله عليه و سلم بە كەفارەت دان لە گەل وەصفی ئەعرابی بەوەی لە ڕۆژی رەمەزان لە گەل خێزانی كۆبووتەوە هۆكاری كەفارەت دانە بە ئازاد كردنی كۆیلە یا پێدانی خواردن یا بە ڕۆژوو بوون.

**بەیتی سیانزەیەم**

**ثمت إجماع وقيس وعمل مدينة الرسول أسخى من بذل**

لەم بەیتە باس لە چەند سەرچاوەیەكی تر لە بنچینەكانی حوكمە شەرعیەكان دەكات كە ئەوانیش كۆدەنگی ( **إجماع**)، بەراوردكردن ( **قياس**)، و كارپێكردنی خەلكی شاری مەدینەی ( **عمل أهل المدينة**) نەبەویە، كە إن شاءالله تعالى یەكە یەكە شیان دەكەینەوە.

**سەرچاوەی حەوتەم كۆدەنگی ( إجماع)**

كۆدەنگی یا ( **إجماع**) لە زمانەوانی لە (عزم) هاتووە واتە نیازی ئەنجام دانی كارێك بە دڵنیایەوە و لە ڕووی زاراوە: بریتیە لە هاوڕا بوونی موجتەهیدەكانی ئۆمەتی ئیسلامی. و هەروەك لە پێناسە دا هاتووە بۆ ئەوەی كۆدەنگی دابمەزرێت دەبێت كۆك بوون و هاوڕا بوون هەبێت لە نێو هەموو موجتەهیدەكان ( هەرچەندە هەندێ پێیان وایە

[٢٢] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطى، ل ١٤

جیاوازی یەك یا چەند كەسێك زیان ناگەیەنێت بە كۆدەنگی زۆرینەی هەرەزۆری غەیری ئەوان). هەروەها كۆدەنگی دەبێ لە سەر ئاستی ئۆمەتی ئیسلامی بیت نەك موجتەهیدەكانی شار یا وولاتێك یا گۆریەكی دیاریكراو و هەروەها دەبێت كۆدەنگی لە سەر حوكمێكی شەرعی بێت و غەیری ئەوە بە كۆدەنگی دانانرێت. هەروەها هەروەك هەندێ لە زانا ئۆصولیەكان لە پێناسەكانیان ئاماژەیان پێداوە پێویستە كۆدەنگیەكە لە دوای وەفاتی رسول الله صل الله علیه و سلم بێت.[٢٣]

كۆدەنگی ( **إجماع**) بەلگەیەكی بە هێز و دلنیایەو كار پێكردنی ئەركە لە سەر موسلمانان وەك خوای تعالی دەفەرموێت: " **و من یشاقق الرسول من بعد ما تبین له الهدى و یتبع غیر سبیل المؤمنین نوله ما تولى و نصلیه جهنم و ساءت مصیرا**" و هروەهك لە سوننەتیش دا دەقی زۆر هەیە لە سەر پاك بوون ( **عصمة الأمة**) ی ئۆمەت گەر كۆبوونەو لە سەر كارێك. بەلام لە گەل ئەوەش لە پێناو دروست بوونی كۆدەنگی دەبێت بە پێ ی بەلگەی شەرعی بێت و بە پێ ی پێودانگ و رێچكەی دیاریكراو بێت نەوەك لە سەر هەواو هەوەس و ئارەزوو.

### جۆرەكانی كۆدەنگی:

١. كۆدەنگی ئاشكرا ( **الإجماع الصریح**): بە تایبەت گەر هەموو كوجتەهیدەكان لە یەك شوێن بن و بە ئاشكرا و روونی هاوڕابوونی خۆیان دەربرن.
٢. كۆدەنگی بێ دەنگ ( **الإجماع السكوتی**): گەر موجتەهیدێك لە مەڕ بابەتێك ڕای خۆی دەربڕێت و موجتەهیدەكانی تر لێ ی ئاگادار بن و بێ دەنگ بن لە ئاست ئەم فەتوایە و هیچ بەربەستێكیش نەبێت بۆ ڕادەبڕینیان و ماوەیەكی باشیش بە سەر دا تێپەڕێت. ئەم جۆرە لای مالكی و شافعیەكان بە كۆدەنگی دانانرێت و بە لگەی دانانێن بەلام زۆربەی حەنەفیەكان لە گەل حەنبەلیەكان بە كۆدەنگی دایدەنێن و لای ئەوان حوجەیە و دەبێ وەك جۆری یەكەم واتە كۆدەنگی ئاشكرا كاری پێ بكرێت. هەندیكش لە حەنەفی و شافعیەكان بە كۆدەنگی دایناێن بەلام بە حوجەیەك كە جێگای گومانە واتە ( **الحجة الظنیة**) هەژماری دەكەن.

### مەرجەكانی كۆدەنگی:

١. بە شێوازێكی ڕاست و دروست هەبوونی بسەلێنرێت، ئەوجا چ ناسراو بێت لای زانایان یا خود ئەوەی كۆدەنگیەكە دەگێرێتەوە كەسێكی خاوەن زانستێكی بەرفراوان بێت.
٢. پێش هەبوونی ئەو كۆدەنگیە هیچ جیاوازیەكی جێگیر لە ئارادا نەبێت لە بەر ئەوەی گەر جیاوازی بیروڕا هەبوو ئەوا كۆدەنگی دانامەزرێت لە بەر ئەوەی جیاوازی زانایانی پێشوو بە مردنیان هەلناوەشێتەوە.
٣. هەبوونی مەرجەكانی ئیجتیهاد لە موجتەهیدەكان.
٤. ئەو كەسەی ئیجتیهادی كردووە ئاكاری عەدالەتی تێدا بێت و دوور بێت لە بیدعە.
٥. كۆدەنگیەكەیان پشت بە بەلگەی قورئان و سوننەت ببەستێت.

---

[٢٣] الوجیز فی أصول الفقه، د. عبدالكریم زیدان ل ١٨١

٦. جمهور لە سەر ئەو ڕایەن کە مەرج نیە ئەوانەی لە سەردەمی ئەوان کۆدەنگی دروست بووە و بەشێکن لە کۆدەنگیەکە هەموویان وەفات بکەن و ناکرێت ئەوانەی بەشدار بوون لە کۆدەنگیەکە لە ئەهلی یەك سەردەم و ئەوانەی دوای ئەوانیش پێچەوانەی کۆدەنگیەکە بجولێنەوە.

## ووتەی هەندێ لە پێشینە چاکەکان ڕەزای خوایان لێ بێت و گەورە زانایان لە سەر بەلگە بوونی کۆدەنگی ( الإجماع):

- وەك ئەوەی لە نێو نامەی عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێ بێت هاتووە کە بۆ قازی شورەیح ڕەحمەتی خوای لێ بێت نوسیویەتی و تیایدا فەرمویەتی: کار بە کتابی خوای تعالی بکە، گەر نەت دۆزیەوە کار بە سوننەتی پێغەمبەری خوا بکە صل الله علیه و سلم، گەر نەت دۆزیەوە کار بە قەزاوەتی چاکەکانی پێش خۆت بکە و لە ریوایەتێك هاتووە: ئەوەی خەلکی لە سەری کۆدەنگن. ئیبن ئەبی شەیبە لە مصنف ٢٤٠/٧ و بەیهەقی ١١٥/١٠ و نەسائی ٢٣١/٨ تەخریجیان کردووە.
- قازی ئەبو یەعلا ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: کۆدەنگی بەلگەیەکی بە هێزە و دەبێت کاری پێ بکرێت و حەرامە پێچەوانەی بجولێتەوە و ناکرێت ئۆمەت لە سەر هەلە کۆببێتەوە.[٢٤]
- ئیبن حەزم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: هەرکەسێك دوای ئەوەی ئاگای لە کۆدەنگی بوو یا حوجەی لە سەر تەوا کرا و ئێنجا بە پێچەوانەی بجوولێتەوە ئەوا شایستەی ئەو سزایە دەبێت کە لەم ئایەتە باس کراوە " و من و من يشاقق الرسول من بعد ما تبين له الهدى و يتبع غير سبيل المؤمنين نوله ما تولى و نصليه جهنم و ساءت مصيرا ".[٢٥]

## بەلگە بوونی کۆدەنگی

سەبارەت بە حوجیەت وبە بەلگە بوونی کۆدەنگی ( الإجماع) ئەهلی سونەت و جەماعەت بە سەرچاوەیەکی بەلگە هێنانەوەی حوکمە شەرعیەکان دەیزانن و تەنیا ( رافزیەکان، خەواریج، نیزامیەکان لە موعتەزیلە) ڕەتی دەکەنەوە و ئەوەی کە ڕەتی بکاتەوە بە بیدعەیەکی زۆر ناشیرین لە قەلەم دەدرێت. ئەوەش کە کۆدەنگی لە سەری هەیە بە ٣ بەش دابەش دەکرێت: پێویست ( ضروري)، بە ناوبانگ ( مشهور) و گریمانە ( نظري). ئەوەی یەکەم واتە کۆدەنگی پێویست بە بێ جیاوازی ئەوەی ڕەتی بکاتەوە بە کافر دادەنرێت وەك حەرام بوونی زینا خوا بمان پارێزێت. و کۆدەنگی بە ناوبانگ ( المشهور) وەك ریبای جاهلیەت و نەسیئەت گەر لە کتاب و سوننەت حەرام بوونەکەی چەسپابوو ئەوا ئەوەی ڕەتیان بکاتەوە ئەوا ئەوانیش بە کافر دەژمێردرێن. و بەلام کۆدەنگی گریمانە ( نظری) بە بێ جیاوازی ئەوەی ڕەتی بکاتەوە بە کافر ناژمێردرێت تەنانەت گەر لە کتاب و سوننەتیش هاتبێت وەك بەتاڵ بوونی حەج بە جووت بوون لە گەل خێزان پێش ڕاوەستانی عەرەفە هەروەها وەك وەگرتنی یەك لە سەر شەشی میرات لە لایەن کچی کوور لە گەل کچی مردوو ئەم دووانە بە شێوەی گریمانەیی کۆدەنگی لە سەری هەیە.[٢٦]

---

[٢٤] العدة في أصول الفقه، لقلضي أبو يعلى المكتبة الشاملة ل ٤/ ١٠٥٨

[٢٥] مراتب الإجماع لإبن حزم ل ٧

[٢٦] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطى، ل ١٦

## نموونەی کۆدەنگی (الإجماع):

دیارە کۆدەمگی لە سەر زۆر بابەت هەیە و ناکرێت هەموویان باس بکرێت بەلام تەنیا وەك نموونە ئاماژە بە هەندێ بابەتی کۆدەنگی دەکەین.

١. **لە دوای وەفاتی رسول الله صل الله علیه و سلم:**[٢٧]

- لە سەر دەمی هاوەلان: واجب بوونی دیاریکردنی خەلیفە لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم. هەروەها پێویست بوونی شەڕ کردن لە گەل ئەوانەی زەکات نادەن.
- قەدەغە بوونی دروست کردنی کەنیسە و فرۆشتنی لە نێو وولاتی موسلمانان.

٢. **نمونەی کۆدەنگی لەم سەردەمە:**

- کۆدەنگی لە سەر حەرام بوونی نواندنی پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم و باقی پێغەمبەران صلوات الله علیهم، لە فیلم و دراماکان.

## سەرچاوەی هەشتەم بەراوردکاری ( قیاس)

بەراوردکاری ( **قیاس**) لە زمانەوانیدا: واتە هەلسەنگاندن وەك ئەوەی دەلێت ( **قست الثوب بالذراع**) واتە قوماشی جل و بەرگم بە یەك باڵ پێوانە کرد. لە ڕووی زاراوە دا زانا ئوصولیەکان بەوە پێناسەیان کردووە کە بریتیە لە: حوکمی بنچینە بە سەر لقەکەدا بسەپێنرێت لە بەر هەبوونی هاوبەشی لە نێوانیان دا. [٢٨]

**پێناسەیەکی تر بۆ قیاس** : ئەوەی کە دەق لە سەر حوکمە کەی نەهاتووە بخەیتە پاڵ ئەوەی کە دەق لە سەر حوکمەکەی هەیە لە بەر هەبوونی هاوبەشی لە هۆکاری ( **علة**) ی حوکمەکە.

لەم دوو پێناسە بە دەردەکەوێت کە قیاس بریتیە لەوەی کە مەسەلەیەك کە لە ڕووی شەرعیەوە بە دەق حوکمی لە سەر هەیە حوکمەکەی بچەسپێنرێت لە سەر مەسەلەیەکی تر کە هۆکارەکەیان هاوبەشە و لە بنچینە لە یەك دەچن بەلام حوکمی لە سەر نیە وەك حەرام بوونی مەی و شەراب کە لە کتاب و سوننەت دەقی لە سەر حەرام بوونی هەیە حوکمەکەی دەچەسپێنرێت لە سەر مادە سڕکەرەکان کە دەقی لە سەر نیە لە بەر ئەوەی هۆکاری حوکمەکە هاوبەشە لە نێوانیان ئەویش ( سەرخۆش کردن) و لە نێو بردنی عەق ل و هۆشە.

و قیاس حوکمێك ناهێنێتە کایەوە بەلکو حوکمەکەی بە دەردەخات و حوکمی بابەتێکی هاوشێوە و هاوبەش لە هۆکارەکەی بە سەر دا دەچەسپێنرێت. و قیاس ٤ چوار ڕەکنی هەیە:

١. بنچینە ( **الأصل**): کە قیاسی لە سەر دەکرێت و بە دەق حوکمی لە سەر هەیە.

---

[٢٧] کتابی الفروع و تصحیح الفروع، شیخ الإسلام إبن تیمیه، مکتبه الشامله ل ٣٣٨/١٠

[٢٨] زاد الطالب في أوصل الفقة، أبو لبراء المصري. ل ٧٥

٢. حوكمی بنچینە ( **حكم الأصل**) كە بە دەق لە شەرع هاتووە و دمانەوێت بە سەر مەسەلەیەكی تر كە حوكمی بە دەق نەهاتووە بسەپێینین.
٣. لق كە بە ( **مقیس**) ناودەبرێت و ئەو مەسەلەیە كە بە دەق حوكمی لە سە رنەهاتووە.
٤. هۆكار ( **علة**) كە بریتیە لە ئاكارێك لە بنچینە ( **الأصل**) كە بە هۆیەوە لە شەرع حوكمی لە سەر دراوە.[٢٩]

قیاس لە ڕوانگەی هێز و لاوازیەكەی دابەش دەبێت بۆ ( ئاشكرا ( جلی) و شاردراوە ( خفی). قیاسی ئاشكرا بە ٣ شێواز هەیە: گەر بە دڵنیایەوە جیاوازی كاریگەر لە نێوانیان ڕەت بكرێتەوە، یا خود هۆكارەكە لە دەقە كە دا هاتبێت یا هۆكارەكە كۆدەنگی لە سەری هەبێت. ئەمەیان بە ئاشكرا ناونراوە چونكە پێویست بە دەرخستنی هۆكارەكە و قسە كردن لێ ی نیە. وەك قیاس كردنی سوتاندن و نقوم كردنی ماڵی بێ باوك لە سەر خواردنی ماڵەكەی لە ڕووی حەرام بوونەوە وەك لە دەق هاتووە: ‌فی قولە تعالی " **إن الذین یأكلون أموال الیتامی ظلما إنما یأكلون فی بطونهم نارا و سیصلون سعیرا**" النساو ١٠.
ئەم جۆرە قیاسە و اتە ( **قیاس جلی**) كۆدەنگی لە سەری هەیە و بە هێزترین جۆری قیاس ە و جیاوازی هەیە لە سەر ناونانەكەی و دیارە هەندێك بە چەمكی لە یەك چوون ( **مفهوم الموافقة**) دایدەنێن.
بەلام (**قیاس خفی**) ئەوا بە دڵنیایەوە نەبوونی جیاوازی یەكلا نەبۆتەوە و هوكارەكەش بە دەق نەهاتووە و كۆدەنگی لە سەری نیە وەك قیاس ی كۆشتن بە شتێكی قورس لە سەر كوشتن بە شتێكی تیژ لە ڕووی واجب بوونی قیصاص كردنەوە. لەم جۆرە قیاسە دەبێت قسە لە سەر هۆكارەكە بكرێت ئاخۆ لە لقەكە بوونی هەیە یا نە.[٣٠]
قیاس لای ئیمامی مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە پێش ( **خبر الواحد**[٣١]) ە گەر لە نێوانیان جیاوازی هەبوو. لە بەر ئەوەی خبرالواحد تەنیا حوكمەكەی تێدایە بەلام قیاس هەم حوكم و هەم هۆكارەكە پێكەوە تیایدا بوونی هەیە. و لە سەر كەفارەت و حدودەكان ( وەك ئەوەی زانراوە) دەچەسپێت و لە سەر روخصە و هۆكار و مەرج و بەربەستەكان ناچەسپێت. لە بەر ئەوەی روخصە كان واتاكەی بە عەقل نازانرێت و پێچەوانەی بەلگەیە و قیاس كردن لە سەری دەبێتە هۆی زۆر بوونی جیاوازی ئەوا بۆیە ناكرێت قیاسی تێدا بكرێت.[٣٢]

## نموونەی قیاس:

١. **قیاس العلة**: لێرە بە ڕاشكاوی باس لە هۆكار ( علە) كراوە وەك خاڵی هاوبەش وەك: ‌فی قولە تعالی " **قد خلت من قبلكم سنن فسیروا فی الأرض فانظروا كیف كان عاقبة المكذبین**" ال عمران ١٣٧ واتە: ئەوان بنچینە و ئێوە لقەكەن و هۆكاری هاوبەشیش لە نێوانتان بە درۆخستنەوەیە و حوكمەكەش لە نێوچوونە.
٢. **قیاس الدلالە**: لەم جۆرە باس لە هۆكار ( العلة) نەكراوە بەلام باسی پێدوایستیەك لە پێداویستیەكانی كراوە وەك كاریگەریەكەی یا حوكمەكەی، لێرە خاڵە هاوبەشەكە بەلگەی هۆكارەكەیە وەك: ‌فی قولە تعالی" **و من ایاتە**

[٢٩] الوجیز فی أصول الفقە، د. عبدالركیم زیدان ل ١٩٧
[٣٠] زاد الطالب فی أوصل الفقة، أبو لبراء المصري. ل ٧٦

[٣١] خبر الواحد واتە هەواڵی یەك كەس بریتیە لە ریوایەتی فەرموودەیەك كە لە یەكیك لە توێژەكان یا زیاتر تەنیا یەك كەس ریوایەتی بكات.
[٣٢] تقریب و تهذیب إیصال السالك فی أصول الإمام مالك، أستاذ كریم امصنصف، ل ٢٩

أنك ترى الأرض خاشعة فإذا أنزلنا عليها الماء اهتزت و ربت إن الذي أحياها لمحيى الموتى إنه على كل شيء قدير" فصلت ٣٩ بۆیە بنچینە توانای زیندوو كردنەوەی زەویە، و لقەكەش توانای زیندوو كردنەوەی مردووەكانە و هۆكاریش بە گشتی توانای الله یە سبحانه و تعالى و تەواو بوونی دانایی یەكەیەتی، و و زیندوو كردنەوەی زەویش بەلگەی هۆكارەكەیە.

٣. **قیاس لە مانای بنچینە:** ئەمەش بە هەلوەشاندنەوەی جیاوازی یە بۆیە پێویستی بە پرژانە سەر هاوبەشەكە نیە وەك قوله تعلى: " **و لا تقل لهما أف**" و لێدان و جنێودانیش حوكمی ئۆف كردنی هەیە دەرهەق بە دایك و باب من باب أولى و ئەم جۆرە قیاس ی ڕاشكاو یا ( **قیاس جلی**) یە و بە چەمكی لە یەك چوون ( **مفهوم موافقه**) ش ناوبراوە. [٣٣]

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا قیاس لە هەموو شت ناكرێت بۆ نموونە وەك ئەهلی سوننەت لە سەری كۆكن، قیاس لە یەكتا پەرستی ( التوحید) ناكرێت گەر ببێتە هۆی بیدعە و چواندنی الله جل جلاله بە دروستكراوەكانی و دەبێتە هۆی لە دین دەرچوون و پەك خستنی ناوە جوانەكانی الله جل جلاله و كردەوە و ئاكارە بەرزەكانی سبحانه و تعالى. بەلام گەر بۆ جیاكردنەوەی الله بێت لە دروستكراوەكانی بە قیاس الأولى دروستە وەك قوله تعالى " **و لله المثل الأعلى**" النحل ٦٠، و " **لیس كمثلة شيء**" الشورى ١١.

قیاسیش (فاسد و معتبر) واتە پۆچەل و دروستی هەیە و هەندێكیش لە نێوان هەردووكیانە واتە دڕدوونگ ( متردد) ە. قیاسی دروست ئەوەیە كە لە شەریعەت دا هاتووە بە پێ ی كتاب و سوننەت و بریتیە لە كۆكردنەوەی دوو بابەتی لە یەك چوو و هۆكارەكەیان هاوبەشە و هیچ بەربەستێك نیە. قیاسی پوچەلەیش مانای پێچەوانەی دروستە وەك ئیبن تیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت دەلێت: ( هەر قیاسێك بە هۆی دەقەوە پۆچەل بێتەوە ئەوا پوچەلە و هەر كەسێك دەقێك بە دەقێكی تر قیاس بكات كە حوكمەكەیان پێچەوانەی یەكترە ئەوا دیسان پوچەلە و هەر كەسێك دوو شت یەكسان بكات یا جیاوازی بكات لە نێوانیان بە بێ هەبوونی ئاكاری لە جێ لە حوكمی خوای تعالى و حوكمی پێغەمبەرەكەی صل الله علیه و سلم ئەوا قیاسەكەی پوچەلە. [٣٤]

## سەرچاوەی نۆیەم:كردەوەی خەلكی مەدینە ( عمل أهل المدینة)

سەرچاوەی نۆیەم لە بنچینەكانی ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێ بێت ( كردەوەی خەلكی مەدینە) بریتیە لە و كردەوانەی كە هاوەڵان رەزای خوایان لێ بێت و تابعین رەحمەتی خوایان لێ بێتلە شاری مەدینەی نەبەوی لە سەری كۆدەنگ بوون لە كاروباری دینە كەیان بە مەرجێك لە بابەت گەلێك بێت لە حوكمە شەرعیەكان كە بواری ڕادەربڕین تیایدا نەبێت. ئەم سەرچاوەیەش لای ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێ بێت لە پێش هەوالی تاك واتە ( **خبر الأحاد**) دوەیە. ئەمەش لای ئەو جۆرێكە لە جۆرەكانی كۆدەنگی ( **الإجماع**) كە بە كۆدەنگی تایبەت ( **الإجماع الخاص**) ناسراوە واتە تایبەتە بە سەردەم یا توێژ یا شوێنێكی دیاریكراو. و ئیمامی مالیك وەك چۆن بڕوای بە كۆدەنگی هەیە ئەم جۆرە كۆدەنگیەش لای ئەو سەرچاوەیەكی حوكمە شەرعیەكانە بەو پێ یەی كە زاناانی دانیشتووی مەدینە النبی صل الله علیه

---

[٣٣] زاد الطالب في أوصل الفقة، أبو لبراء المصری. ل ٧٧

[٣٤] مجموع الفتاوی، ابن تیمیه، ٢٨٧/١٩

و سلم پشتاوپشت لە هاوەلان و تابعين و تابعى تابعين لە پێغەمبەرى خوا صل الله عليه و سلم كاروبارى دينيان لێ گواستۆتەوە. ئەمەش لاى ئيمامى ماليك بە هەوالى متواتر داناوە و مەزهەبەكەيەتى. [٢٥]

بەلام مەزهەبى جمهور واتە زۆرينەى زانايان ئەوەيە كە ئەم سەرچاوەيە لە هەوالى تاك ( **خبر الأحاد**) لە پێش تر نيە و بە شێوەى سەربەخۆ و بە تەنيا بە بەلگەى شەرعى دانانرێت لە بەر ئەوەى كارپێكردنى خەلكى مەدينە لاى ئەوان نابێتە كۆدەنگى و تەنيا بەشێكى ئۆمەتن گەر بەلگەيەكى ترلە شەرع پالپشتى كرد لە كارپێكردنى ئەوان ئەوا بە هێزى دەكات.

**نموونە:**

وەك ڕەت كردنەوەى هەلبژاردەى دانيشتن لە فرۆشتن ( **خيار المجلس**)  و پێش فەرمودەى صحيح ى خستووە كە دەفەرموێت صل الله عليه و سلم ( **البائعان بالخيار ما لم يتفرقا**) واتە هەردوو كڕيار و فرۆشيار مافى هەلبژاردەيان هەيە تا ئەو كاتەى مەجليسەكەيان جێ نەهێشتووە. و هەروەها ڕەت كردنەوەى زەكات لە سەوزە مەنى ( **زكاة الخضروات**).

## بەيتى چواردە و پانزەيەم و شانزەيەم

| | |
|---|---|
| وقول صحبه والاستحسان | هو اقتـفاء ما له رجـــحـــان |
| وقيل بل هو دليل ينقذف | في نفس من بالاجتهاد متصف |
| ولكن التعبير عنه يقصــر | به فــلا يعـلـم كيف يخـــبر |

## سەرچاوەى دەيەم: ووتەى هاوەلان ڕەزاى خوايان لێ بێت

ووتەى هاوەلان ڕەزاى خواى تعالى لە هەر هەموويان بێت يەكێكى ترە لە سەرچاوەكان لاى ئيمامى ماليك ڕەحمەتى خواى لێ بێت و بە بەلگەى شەرعى دادەنرێت لاى ئەو، ئەوجا ئەو هاوەڵە بەرێزە پێشەوا بێت يا موفتى بێت يا كاربەدەست و چ بە قسە بێت و چ بە كردەوە جياوازى نيە. ووتەى هاوەڵيش بريتيە لەو ڕايەى كە بە ئيجتيهادەوە دەربڕيوە و مەرجە لاى ئيمامى ماليك ڕەحمەتى خواى لێ بێت كە بلاوبووبێتەوە و كەس ڕەتى نەدابێتەوە ( باجى لە ماليك نەقلى كردووە و شيخ الإسلام ئيبن تيميە ش هەمان ووتەى هەيە[٣٦]). و هاوەلێكى موجتەهيد لە سەرى پێويست نيە پابەند بێت بە ڕاى هاوەلێكى تر بەلام موجتەهيدێكى تابعى دەبێت پەيوەست بێت بە ڕاى هاوەلان ڕەزاى خوايان لێ بێت.

بۆ ئەوەى ووتەى هاوەلان بە بەلگە وەربگيرێت وەك ووتمان پێويستە دوو مەرجى تيا بێت:

١. پێچەوانەى دەقێكى شەرعى نەبێت
٢. بە پێ ى قياس بەرپەرچ نەدرێتەوە.

---

[٢٥] تقريب و تهذيب إيصال السالك في أصول الإمام مالك، أستاذ كريم امصنصف، ل ٣٠

[٣٦] مجموع الفتاوى، ابن تيميه، ١٤/٢٠

**ووتەی هاوەڵیش لەم شەش شێوازە بە دەر نیە:**

**یەکەم:** لە پێغەمبەری خوای بیستبێت صل الله علیه و سلم

**دووەم:** لە کەسێکی بیستبێت کە لە پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم ی بیستووەلە بەر ئەوەی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت لەوە دەترسان زۆر فەرمودەی لێ بگێڕنەوە و لای ئەوان شتێکی گەورە بوو و کەم ڕیوایەتیان دەکرد مەبادا زیاد و کەمی تێبکەوێت.

**سێیەم:** یا خود تێگەیشتنیان لە ئایەتێك لە کتاب الله جل جلاله کە لە ئێمە شاردراوەیە.

**چوارەم:** هەموویان لە سەری کۆك و هاوڕا بوونە بەلام تەنیا ڕا و فەتوای یەکێکیان بۆ ئێمە گواستراوەتەوە.

**پێنجەم:** لە بەر تەواو شارەزابوونی بە زمانی عەرەبی و واتای واژەکان بەوجۆرە تەنیا ڕایەکی هەبووە بە جیا لە ئێمە، یاخود هەندێ ئاماژەی دەلالەتی حالەت بۆ خیتابەکە یا خود کۆی گشتی هەندێ شت کە بە درێژایی زەمەن لە بینینی پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم و تێڕوانین لە کار و کردەوەکانی تێگەیشتنێکی بۆ دروست بووە. هەروەها زانینی مەبەستەکانی و ئامادەبوون و بینینی دابەزینی سروش ( **وحی**) و بینینی ڕاڤە کردنی بە کرداری بە جۆرێك تێگەیشتنی لا دروست کردووە کە ئێمە لێ ی تێناگەین.

**شەشەم:** تێگەیشتنەکەی لە لایەن پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم رەت نەکراوەتەوە بەلام لە تێگەیشتنەکەی نەپیێکاوە و ئەوەی مەبەست بووە شتێکی تر بووە جیا لە تێگەیشتنەکەی. و بەم لێکدانەوە ئەم جۆرەیان نابێتە بەلگەی و حوجەت.[٣٧]

## سەرچاوەی پانزەیەم: بە چاك زانین ( الإستحسان)

هەر لە بەیتی پانزەیەم دانەری مەنزومە ڕەحمەتی خوای لێ بێت باس لە سەرچاوەیەکی تر دەکات کە ئەویش بە چاك زانین ( **الإستحسان**) ە و ئەلێت ( **و هو إقتفاء ما له رجحان**) واتە بریتیە لە هەلگرتنەوە و کار پێگردنی ئەو شتەی کە بەلگە بە ڕاست دانراوەکە ( **راجح**) لە سەر بەلگە شەرعیە کانی تر کە پێچەوانەیەتی. و گەر بەم لێکدانەوەیە وەربگرین ئەوا پێویستە کاری پێ بکرێت لە بەر ئەوەی کۆ دەنگی هەیە کە پێویستە لە نێوان دوو بەگەی هاودژ کار بەو بەلگەیە بکرێت کە ڕاست ترە. [٣٨]

هەروەها لە بەیتەکەی تر هاتووە: **وقیل بل هو دلیل ینقذف	فی نفس من بالاجتهاد متصف**

واتە ئەوەش ووتراوە کە بەلکو ( **إستحسان**) ئەو بەلگەیە یە کە دەکەوێتە نێو دلی ئەو کەسەی کە بە ئیجتیهاد وەصف کراوە.

مانای **إستحسان** لە زمانەوانی بریتیە لە: بە چاك زانینی شتێك هەروەها بەو شتەش دەووترێت کە مرۆڤ حەزی بۆ دەچێت و مەیلی بۆ هەیە تەنانەت گەر خەلکی تر سلی لێ بکەنەوە.

لە ڕووی زاراوە بە پێناسەی جیاواز لێك دراوەتەوە بۆ نموونە:

بەزجەوی دەڵێت: إستحسان بریتیە لە وازهێنان لە پەیەوست بوون بە قیاسێك بۆ قیاسێکی بە هێز تر لەو.

---

[٣٧] زاد الطالب فی أوصل الفقه، أبو لبراو المصری. ل ٦٢

[٣٨] تقریب و تهذیب إیصال السالك فی أصول الإمام مالك، أستاذ كریم امصنصف، ل ٣٢

فەقیهی حلوانی حەنەفی پێ ی وایە: إستحسان بریتیە لە وازهێنان لە قیاسێك بۆ بەلگەیەکی تر لە کتاب و سوننەت و قیاس کە لەوەی تر بە هێزترە.

هەندێ لە حەنبەلیەکانیش دەڵێن: إستحسان بریتیە لە وازهێنان لە حوکمی هاوشێوەی مەسەلەیەك لە بەر بەلگەیەکی شەرعی تایبەت.

کۆی ئەم پێناسانەش ئەوەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە واتای إستحسان ئەوەیە: وازهێنان لە قیاسی ئاشکرا بۆ قیاسی شاراوە، یا خود هلاوێر کردن ( إستثناء) ی مەسەلەیەکی لاوەکی لە بنچینەیەکی گشتی بە هۆی بەلگەیەك کە نەفسی موجتەهید لە سەری دلنیا بۆتەوە کە ئەم هەلاوێر کردن یا وازهێنانە ڕاست و دروستە.[39]

**نموونە:**

**إستحسان بە پشت بەستن بە کتاب و سوننەت:**

١. جایز بوبونی وەسیەت کردن. هەموو زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی وەسیەت کردن جایزە بەلام حەنەفیەکان بە بەلگەی إستحسان هەمان حوکم دەچەسپێنن و دەڵێن بە پێ ی قیاس نەدەبوایە قیاس جایز بێت بەلام بە هۆی پێداویستی خەلکی بە باش دادەنرێت. هەرچەندە وەسیەت کردن لە قورئان و سوننەت بەلگەی لە سەروە وەك قوله تعالی: " **من بعد وصیة یوصین بها أو دین**" النساء ١٢، و لە سوننەتیش دا بە بەلگەی ئەو فەرمودەی کە ئیبن ماجە لە ئەبی هورەیرە دەگێرێتەوە کە پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم فەرمویەتی: ( **إن الله تعالی تصدق علیکم بثلث أموالکم في اخر أعمارکم**). خوای تعالی بە سێ لە سەر یەکی مال و سامانتان صەدەقەتان پێ دەکات لە کۆتایی تەمەنتان.[40]

٢. لێدانی ئافرەتێکی بە زگ و لە بار چوونی کۆرپەلەی نێو زگی بە هۆی لێدانەکەوە. زوفەر لە حەنەفیەکان دەلێت هێچی لێ ناکەوێت لە بەر ئەوەی ژیانی کۆرپەلە نەسلمێنراوە و نازانرێت و ناکرێت بۆ بوونەوەرێك کە هێشتا ژیانەکەی نەزانراوە قەرەبۆ و دیە دابنرێت. هەموو مەزهەبەکانی تر (غورە) یان داناوە کە دەکاتە نیوەی دەیەکی دیەکەی بە بەلگەی سوونەت حەنەفیەکانیش (بێجگە لە زوفەر) بە إستحسان هەمان حوکمیان پێ پەسەندە. بە بەلگەی فەرمودەی کە دەفەرموێت صل الله علیه و سلم: ( **في الجنین غرة عبد أو أمة قیمته خمسمائة**).[41]

[39] الوجیز فی أصول الفقه، د. عبدالرکیم زیدان ل ٢٣١

[40] الإستحسان و نماذج من تطبیقاته في الفقة الإسلامی، د. فاروق عبدالرکیم ل ٣٧٥

[41] بوخاری لە ئەبو هوریرە دەگێرێتەوە رەزای خوای لێ بێت بە بێ زیادەی ( خمسمائه دینار)، ئەبوداود لە سونەنەکەی ٤٩٩/٢ لە شەعبی دەگێرێتەوە کە فەرمویەتی: خمسمائه یعنی درهما و لە ربیعه کە فەرمویەتی: خمسون دینارا

**بەیتی حەڤدەیەم:**

**وسد أبواب ذرائع الفساد فمالك له على ذاك اعتماد**

**سەرچاوەی دوانزەیەم: داخستنی دەرگاكانی مەهانە و فەساد ( سد الذرائع)**

دانەری مەنزومە رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: داخستنی دەرگاكانی مەهانە ی فەساد لای ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێ بێت پشتی پێ دەبەسترێت.

مەهانە ( **الذریعة**) لە زمانەوانی واتە: ئامراز و هۆكار بۆ شتێك و بنچینەكەشی لە زمانی عەرەب بریتیە لە و شتەی كە ووشترێك كە بەرەڵا بووە پێ دەستە مۆ دەكرێت تا بە هۆیەوە بگیرێتەوە.

لە زاراوە بریتیە لە: لەو رێچكەی كە لە خۆیدا رێگە پێدراوە بەلام پەل دەكێشێت بۆ قەدەغەكراوێك، بۆیە خۆی لە خۆیدا ئامانج نیە بەلام ئامانج لێ ی گەیشتنە بە شتی مەبەست. ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: مەهانە ئامراز و رێچكەی گەیشتن بە شتەكە نیە بەلام لە عورفی زانایان بریتیە لە وەی كە دەبێتە رێگە خۆشكەر بۆ كاری حەرام و گەر ئەمەی لێ نەكەوێتەوە ( واتە حەرام) ئەوا خودی خۆی بە مفسدە ناژمێردرێت.[42]

دیارە لە گەل مەهانە بۆ كاری خراپ ( **سد الذرائع**) شتێكی تر هەیە بە ناوی فێل ( **الحیل**) كە مانایەكی نزیك دەبەخشێت ئەمەشیان بریتیە لە بە درەخستنی كارێكە رەوا بۆ ئەوەی بە هۆیەوە بگاتە حەرام و پێ ی بشارێتەوە. و ( **حیلة**) ش لە ( **تحول**) دێت واتە گۆرین و شتێكی زەم كراو و نەگریسە بۆ حەرام كردنی حەلال و پیچەوانەكەی و هەروەها پەك خستنی حدود و پێشێل كردنی مافی الله تعالی و بەندەكانی لە لایەن گوناهبار و مونافیق و جولەكە و گاور بە كار هاتووە و بە كار دێت. و زانایانیش هەندێك جیاوازیان كردووە لە نێوان فێل ( **حیلة**) و مەهانە ( **الذریعة**) و هەندێكیش بە پەیوەندی عام و خاص دایانناوە بەلام بە گشتی جیاوازیەكەیان بریتیە لەوەی كە مەهانە ( ذریعة) مەبەست و ئامانج لە خودی خۆیدا بریتی نیە لە گەیشتن بە حەرام و مفسدە بەلام فێڵ ( **حیلة**) مەبەست لێ ی لە سەرەتاوە گەیشتنە بە حەرام و قەدەغەكراو و الله أعلم.

نموونە بۆ ئەوەی مەهانە یە بەلام فێڵ نیە" وەك جنێودان بە بتەكان لە بەر ئەوەی نەبێتە مەهانەیەك بۆ جنێو دان بە الله تعالی خوا پەنامان بدا.

نموونە بۆ ئەوەی كە فێلە بەلام مەهانە نیە: ئەوەی لە شتی حەلال و مباحات فێلی تیا ئەكرێت وەك فرۆشتنی نیصاب لە ماوەی سالەكەدا بۆ هەلاتن لە زەكات.

نموونەش بۆ ئەوەی لە هەمان كات فێڵ و مەهانەشە: وەك كرینەوەی فرۆشیار لە كریارەكە بە نرخی كەمتر لەوەی پێ ی فرۆشتووە.

[42] أصول مذهب الإمام أحمد دراسة أصولية مقارنة، د. عبدالله بن عبدالمحسن التركی ل ٤٩٧

پوچەل كردنەوەی فێڵ ( **إبطال الحيل**) واتە: پوچەل كردنەوەی و گوێ پێ ەدان بەم فێڵە بە شێوەیەك هەلسوكەوتەكەی هەلدەوشێنرێتەوە و بە پێچەوانەی مەبەستەكەی مامەلەی لە گەل دەكرێت لە بەر ئەوەی كاتێك فێلەكەی بە كار هێنا مەبەستی هەلاتن بووە لە حوكمێكی شەرعی و بە هۆیەوە فێلەكەی دەبێت پوچەل بكرێتەوە و هیچ كاریگەری نەبێت.[٤٣]

## جۆرەكانی مەهانە ( الذرائع):

١. ئەوەی خەلكی كۆكن لە سەر داخستنی: وەك ڕێگرتن لە جنێو دان بە بتەكان بۆ ئەو كەسەی كە دەزانێت بە هۆیەوە جنێو دەدرێتە زاتی الله جل جلاله پەنا بە خوا. و هەروەها وەك هەلكەندنی بیر و چاڵ لە سەر ڕێگای موسلمانان گەر بزانرێت موسلمانی تێ دەكەوێت.
٢. ئەوەی خەلكی كۆكن لە سەر دانەخستنی: وەك ڕێگرتن لە چاندنی داری ترێ لە ترسی دروست كردنی شەراب، هەروەها خانوو لە پاڵ یەك كردن لە ترسی زینا.

ئەوەی جیاوازن لە سەری: وەك نەزەر كردن لە ئافرەت لە بەر ئەوەی مەهانەیە بۆ زینا هەروەها قسەكردن لە گەلیا هەروەها وەك فرۆشتنی بە وادە ( بيوع الأجال).

هەروەها دابەش كردنی تریش هەیە بۆ جۆرەكانی مەهانە لە نێوان زانایان كە نامانەوێت باسە كە درێژ بێت.

## جێ بە جێ كردنی بنچینەی ڕیگرتن لە مەهانەكان ( سد الذرائع):

دیارە ئەمەیان لای ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای تعالای لێ بێت لە زۆربەی بابەتە فیقهیەكان پەیڕەو كراوە و هەندێكیش پێیان وایە غەیری مالیك لە سەرۆك مەزهەبەكان وەك ئیمامی شافیعی رەحمەتی خوای لێ بێت كار بەم بنچینەیە ناكەن. بەلام لە ڕاستیدا وەك قورتوبی دەلێت: ڕێگرتن لە مەهانەكان ( سد الذرائع) بۆچوونی مالیك و هاوەلانیەتی، و زۆر بەی خەلكی بە بنچینە دان ( **تأصيل**) دژی وەستاونەتەوە، و لە زۆربەی لقەكان بە شێوەی ووردەكاری كاریان پێ كردووە. و قەرافی لە زانایانی مالیكی دەلێت: مالیك لە سەر ئەم بابەتە تەنیا نیە بەلكو هەمووان ئەمەیان ووتووە و جیاوازی مالیك لەو ڕووەوە تەنیا لە بەر زۆر بەكارهێنانیەتی.[٤٤]

بنەما: هەركاتێك مەبەستەكە مانای نەمێنێت مانای ئامرازەكەش نامێنێت بەو پێ یەی كە تابعی ئەوە، بەلام ئەم بنەمایە لە هەندێ حالەت كاری پێ ناكرێت وەك موس هێنان بە سەرێك كە مووی نیە لە كاتی حەج هەرچەندە كە ئامرازێكە بۆ قرتاندنی قژ.

**تێبینی**: هەندێ جار ئامراز و هۆیەكی حەرام دەبێتە ڕێگە پێدراو گەر بەرژەوەندیەكی لە پێشی پێ دەستە بەر بكرێت، وەك پێدانی پارە بە ناهەق بە كەسێك بۆ ئەوەی زینا لە گەل ئافرەتێك نەكات گەر هیچ ڕێگایەك نەبێت بۆ ڕێگری كردن لەم كارە جگە لەمە. ئەمەش بە خۆگونجاندنی ناچاری ( مداراة) دادەنرێت كە ئەمەش زانایان قسەیان لە سەر چۆنیەتی وەسف كردنی هەیە.[٤٥]

---

[٤٣] هەمان سەرچاوە ل. ٥٠٤

[٤٤] سەرچاوەی پێشوو ل ٥٠٩

[٤٥] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ٢١

**بەیتی هەژدەیەم:**

**وحجة لديه الاستصحاب وراْيه في ذاك لا يعاب**

## سەرچاوەی سیانزەیەم: بریتیە لە گەراندنەوە بۆ سەرچاوەی بنەڕەتی ( الإستصحاب)

لە زمانەوانی ( **إستصحاب**) واتە: داوای هاوڕێتی و بەردەوام بوون و لە زاراوە: بریتیە لە بەردەوامێتی چەسپاندنی ئەوەی چەسپاوە یا خود ڕەت كردنەوەی ئەوەی ڕەتكراوەیە، یا خود هێشتنەوە لە سەر باری پێشوو گەر شتێك لە ئارا نەبێت كە بیگۆڕێت.[٤٦] هەروەها پێنتسە كراوە: چەسپاندنی حوكم لە كاتی ئێستا لە سەر بنەمای چەسپانی لە كاتی ڕابردوو لە ڕووی بوون و نەبوون، واتە ئەوەی پێشتر هەبووە ئەوا بە هەبوون دادەنرێت و بە پێچەوانەوە.[٤٧]

### جۆرەكانی إستصحاب:

گێڕانەوەی باری پێشوو ( **إستصحاب**) دوو جۆری هەیە:

٣. یەكەم: گێڕانەوەی نەبوونی بنەڕەتی ( **إستصحاب العدم الأصلي**) كە ئەمەیان بە پاكانەی بنەڕەتی ( **البراءة الأصلية**) ناودەبرێت. و ئەمەیان بریتیە لە نەچەسپاندنی حوكمە شەرعیەكان بە سەرمان هەتاوەكو بەلگە لە سەر چەسپاندنەكەی نەبێت. و نابێتە بەلگەی شەرعی تەنیا لە دوای گەڕان نەبێت بە دوای بەلگ لە كتاب و سوننەت كە دەلالەت بكاتە لە سەر پێچەوانەی نەبوونی بنەڕەتی، بۆیە گەر ئەمە بوونی نەبوو ئەوا حوكم بە پاكانە دەدرێت لە سەر تەكلیف و ئەمەیان بریتیە لە حەلال بوونی عەقلی و بنچینەكەشی ئەو ئایەتەیە كە الله تعالى دەفەرموێت: " **و ما كنا معذبين حتى نبعث رسولا**" الإسراو ١٥.

٤. جۆری دووەم بریتیە لە گێرانەوە ی چەسپاندنی ئەوەی شەرع ئاماژە بە چەسپاندنی دەكات لە بەر هەبوونی هۆكارەكەی تا ئەو كاتەی كە نەبوونەكەی نەسەلمێنرێت. ئەمەش مانای ووتەی زانا یانی شارەزا لە فیقهە كە دەڵێن: (**الأصل بقاء ماكان على ما كان**) واتە بنچینە هێشتنەوەی ئەو شتەیە لە سەر باری ڕابردوو.[٤٨]

### بە بەلگە بوون ( الحجية) ی إستصحاب:

سەبارەت بە گێڕانەوەی نەبوونی بنەڕەتی ( **إستصحاب العدم الأصلي**) ئەمەیان هەموو مەزهەبەكان كۆكن لە سەر ئەوەی بەلگەیە وەك واجب نەبوونی نوێژی شەشەم لە فەرزەكان لە بەر ئەوەی بەلگەی لە سەر نیە.

---

[٤٦] الوجيز في أصول الفقه، د. عبدالركيم زيدان ل ٢٦٧

[٤٧] تقريب و تهذيب إيصال السالك في أصول الإمام مالك، أستاذ كريم امصنصف، ل ٣٥

[٤٨] سەرچاوەی ڕابردوو ل ٣٥

بەلام جیاوازی هەیە لە نێوان مەزهەبەکان لە بارەی جۆری دووەم کە پێ ی دەڵێن گێڕانەوە بۆ حالەکەی وەك پێ ی دەڵێن: **الأصل بقاء ماكان على ما كان** ، لە مەیان زۆربەی زانایان بە بەلگەی شەرعی دایدەنێن تەنیا ئەبو حەنیفە نەبێت ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە ئەمە جۆرەیان بە بەلگە دانانێت بە بیانوی ئەوەی کە گێڕانەوە ( الإستصحاب) هەموو شتێك دەگرێتەوە و گەر گشتگیری زۆر بوو ئەوا تایبەت کردنیش تیایدا زۆر دەبێت و هەر شتێکیش تایبەت کردن واتە ( **تخصیص**) تیایدا زۆر بوو ئەوا واتای لاواز دەبێت بۆیە بۆ بەلگە ناشێت.[٤٩]

پۆلێنێکی تر بۆ جیاوازی نێوان جمهور و ئەبوحەنیفە ڕەحمەتی خوایان لێ بێت لە سەر **(إستصحاب)** ئەوەیە کە لای جمهور ئەم سەرچاوەیە هاوکات بۆ پێ چەسپاندن ( **الإثبات به**) و بۆ پێ ڕەتکردنەوە ( **الدفع به**) دەشێت بەلام لای ئەبو حەنیفە تەنیا بۆ پێ ڕەتکردنەوە ( **الدفع به**) دەشێت.

**بەیتی نۆزدەیەم:**

**وخبر الواحد حجة لديه بعض فروع الفقه قد بني عليه**

### سەرچاوەی چواردەیەم لە بەلگە شەرعیەکان لای ئیمامی مالیك بریتیە لە هەوالی تاکە کان ( خبر الأحاد)

هەوال ( **خبر**) لێرە بە مانای فەرمودە ( **الحديث**) دێت لە پێغەمبەری خوا صل الله عليه و سلم بەلام لێرە مەبەستمان هەوالێکە کە تەنیا یەك کەس دەیگێرێتەوە و خۆی کەسێکی جێگای متمانە و دامەزراوە لە ڕووی هەلگرتن و ڕیوایەت.

هەوالی تاکە کەس ( **خبر الواحد**) لە بەرامبەر هەوالی زۆر گێڕدراوە ( **متواتر**)ە کە زۆر کەس دەیگێرنەوە بە جۆرێك ناکرێت بیربکەینەوە کە ئەمانە لە سەر شتێکی بێ بنەما کۆبوونەتەوە. بۆیە هەوالی تاکە کەس بریتیە لە هەر فەرمودەیەك کە نەگەیشتبێتە ئاستی ( تواتر) و بۆیە لە ڕووی دەلالەتەوە جێگای گومانە و دەبێتە دوو جۆر:

١. پڕاوپڕ ( **المستفيض**): کە لە ٣ سێ کەس زیاتر ڕیوایەتی بکەن
٢. نا پڕاوپڕ ( **غير المستفيض**): کە لە و ژمارەیە کەمتر ڕیوایەتی بکەن

واتە بە کورتی هەوالی تاکەکان ئەوەیە کە لە ڕووی ژمارە و جۆری گێڕانەوە نەگەیشتبیتە ئاستی ( تواتر) و ناکرێت دلنیا بین لەوەی کە لە سەر بابەتێکی بێ بنەما کۆنەبوونەتەوە و ئەمەیان زانستی بیرۆکەیی دەگەیەنێت.[٥٠]

زانایانی بواری فەرمودە باسی بەم جۆرە باسی لێوە دەکەن:

---

[٤٩] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ٢٢

[٥٠] تقريب و تهذيب إيصال السالك في أصول الإمام مالك، أستاذ كريم امصنصف، ل ٣٦

ئیبن خویزمنداد دەڵێت: ئەمەیان زانست دەگەینێت گەر بێت و ئەوەی ڕیوایەتی دەكات عدل بێت و ئیبن حاجبیش ئەم ڕایەی هەلبژاردووە بە مەرجێك ئاماژە ( قرینة) یەكی جیا هەبێت بێجگە لە عەدالە بۆ نموونە وەك ئەوەی هەردوو فەرمودەناس ( شیخان) واتە بوخاری و موسلیم ئەم فەرمودەیان تەخریج كردبێت.

هەروەها ابن حجر لە (نزهة النظر شرح نخبة الفكر) دەڵێت: ئەم جۆرە وەرگرتنە لە ڕووی گەیاندنی زانست بە تەنیا خۆی لە خۆی بە هێز ترە لە زۆری ڕێگاكان ( كثرة الطرق).

و كۆدەنگی هەیە لە سەردەمی رسول الله صل الله علیه و سلم تا ئێستا بەوەی كە پێویستە كار بە هەواڵی تاكەكان بكرێت لە شایەتی دان و فەتوا و حوكمی حاكم و كاروباری دونیایی، و مەزهەبی زۆرینەی زانایان ( جمهور الفقهاء) و ئوصولیەكانیش هەر كاركردنە بە مە لە باقی كاروباری دونیایی.[٥١]

**بەیتی بیستەم:**

**وبالمصالح عنیت المرسله　　　لە احتجاج حفظتە النقلە**

## سەرچاوەی پانزەیەم لە بەڵگە شەرعیەكان لای ئیمامی مالیك بریتیە لە بەرژەوەندیە گشتیەكان ( المصالح المرسلة)

بەرژەوەندیە گشتیەكان یا ڕەهاكان ( ڕهایە لە بەر ئەوەی لە ڕووی شەرع نە ئەمری پێكرایە و نە هەلوەشێنرایتەوە) و بە دوو ناوی ( **المصالح المرسلة**) و هەروەها ( **الإستصلاح**) ناوبراوە. و لای ئیمامی مالیك بەلگەیە و فەرمان بە دەست گرتن بەم بەرژەوەندیانە دەكات و قیاسیشی لە سەر دەكات و بەلگەشی لە كار كردن بەم سەرچاوەیە ئەوەیە كە هاوەڵان ڕەزای خوا لە هەموویان بێت كاریان پێكردووە و دەستیان پێوە گرتووە مادام بەلگەیەكی شەرعی لە سەر پەك خستنیان نەهاتووە.

بەرژەوەندیە ڕەها یا گشتیەكان بریتیە لە بنیات نانی حوكمی شەرعی لە سەر ئەو بەرژەوەندیانەی كە شەرع نە ئەمری پێكردووە نە هەلی وەشاندۆتەوە و ئەو بەرژەوەندیانەش یا بریتیە لە گەیاندنی قازانج یا ڕەواندنەوەی خراپە لە خەلكی. موجتەهیدیش بۆ بڕیار دان لەم بەرژەوەندیانە دەبێت ئاگای لە ئامانجەكانی شەریعەت بێت و ئەمەش جۆرێكە لە قیاس بەلام زۆر بەرفراوانترە لەو. نموونەش وەك لێدانی دز بۆ ئەوەی دان بنێت بە تاوانەكەی ( هەرچەندە گەورە زانایانی مەزهەبی مالیكی و جمهوری زانایان ڕێگە نادەن بە لێدانی دز بۆ دانپیانان لە بەر ئەوەی لە وانەیە بێ تاوان

---

[٥١] سەرچاوەی پێشوو ل ٣٧

بێت و وازهێنان لە لێدانی تاوانبارێك باشترە لە لێدانی بێ تاوانێك)، هەروەها نوسینەوەی قورئان و سوتاندنی هەموو قورئانەكانی تر بێجگە لە وێنەی كۆكراوەی بنەڕەتی لە سەردەمی ئیمام ی عثمان ڕەزای خوای لێ بێت.

**نموونەكان:**

١. قازانج گەیاندن ( **جلب المنافع**): كە بە حاجیات ناودەبرێن وەك: سەپاندنی دەسەلاتی وەلی بۆ مارەبڕینی كچە بچووكەكەی لە ترسی ئەوەی مەبادا كەسی هاوشانی لە كیس بچێت پێش ئەوەی دەرفەتەكان بڕۆن. هەروەها مساقاه ( دارەكان بدەیە كەسێك خزمەتیان بكات و بەروبومەكانیش لە نێوان كرێكار و خاوەن باخچەكە دابەش بكرێت) و هەروەها كرێ لە گرێبەستەكان.

٢. لابردنی خراپەكان ( **درو المفاسد**): كە بە ضروريات ناودەبرێن لە پێناو لادانی خراپە و مەترسی لە سەر دین یا نەفس یا عەقل یا ڕەچەلەك ( نسب) یا سامان یا ناموس ( عرض) وەك: واجب بوونی كوشتنی مرتد ( ئەو كەسەی لە دین هەلگەڕاوەتەوە) لە پێناو پاراستنی دین، واجب بوونی قیصاص بۆ پاراستنی نەفس، واجب بوونی حەدی قذف بۆ پاراستنی شەرەف، واجب بوونی قۆڵ بڕینی دز بۆ پاراستنی سامان و واجب وونی حەدی خمر بۆ پاراستنی عەقل و هۆش.

٣. بەشێكی سێیەم یش بە ناوی ( **تحسينيات**) هەیە كە بە **تتميماتيش** ناو دەبرێت كە بە پەیوەندی بە خۆڕەوشت و مكارم الّخلاق و نەریت و عادەتە چاكەكان هەیە یا پەیوەندی بە فیترەی پاك هەیە وەك ڕیش هێشتنەوە و سمێل كورت كردنەوە، و حەرام كردنی شتی پیس و پۆخلە و واجب بوونی پارەبەخشینە خزمی هەژار وەك باوان و منالەكانی خۆی.[٥٢]

**بەیتی بیست و یەك و بیست و دوو :**

| | |
|---|---|
| ورعي خلف كان طوراً يعمل | وعنه كـــــان طـــــوراً يعـــــدل |
| وهل على مجتهد رعي الخلاف | يجب أم لا فيه قد جرى اختلاف |

**سەرچاوەی شانزەیەم لە بەلگە شەرعیەكان لای ئیمامی مالیك بریتیە لە ڕچاو كردنی جیاوازیە( مراعاة الخلاف) بەلام هەندێ جار كاری پێ دەكات هەندێ جاریش وازی لێ دەهێنێت.**

---

[٥٢] مذكرة في أصول الفقه، محمد أمين بن محمد المختار لشنقيطي ل ٢٠٢



دانەری مەنزمە لەم دوو بەیتە دەڵێت: ڕچاو كردنی جیاوازی هەندێ جار كاری پێ دەكات و هەندێ جار پاش گوێ ی دەخات و ئایا موجتەهید لە سەریەتی ئەم جیاوازیە ڕەچاو بكات پێویستە لە سەری یا نە؟ ئەڵێت لێرە ناكۆكی هەیە لە سەری.

ڕەچاوكردنی جیاوازی: بریتیە لە وەی كە موجتەهیدێك كار بە بەڵگەی كەسێكی تر بكات كە لە گەل ئەو جیاوازە.و پیوەریش لە مەدا، ڕاست تر بوونی بەڵگەی پێچەوانەیە لە سەر بەڵگەی موجتەهیدێك. و مەرجەكەشی ئەوەیەكە نەبێتە هۆكاری كار كردن بە پێچەوانەی كۆدەنگی و ئەوەی ڕچاوی ئەم جیاوازیەش دەكات بە تەواوەتی واز لە مەزهەبەكەی نەهێنێت.[٥٣]

**بۆ نمونە:** ئیمامی مالیك، مەزهەبەكەی سەبارەت بە ژن بە ژنی ( **زواج الشغار** ) هەڵوەشاندنەوەیە، بەلام ئیمامی مالیك كار بە بەڵگەی ڕای پێچەوانەی خۆی دەكات كە دەڵێت سەبارەت بە میرات وەرگرتنی ژن و مێرد لە مارەبڕینی ژن بە ژنی ئەوا مارەیی یەكە بۆ ئەم میرات لێك گرتنە هەڵناوەشێت.

سەبارەت بە بەیتی دووەم كە دەڵێت ئایا موجتەهید لە سەریەتی ڕچاوی جیاوازی بكات یا نە ئەوا ناكۆكی هەیە. ناكۆكی لە سەر ئەوە هەیە ئاخو موجتەهید ڕچاوی هەموو جۆرە جیاوازیەك بكات یا تەنیا ڕەچاوی ئەو پێچەوانە بوون و جیاوازیە بكات كە بە ناو بانگ و مشهورە.

لێرە هەر شانزە سەرچاوەی بەڵگەهێنانەوە لە مەزهەبی ئیمامی مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێت كۆتایی هات و دانەری مەنزومە ئیتر باسی بنەماكان دەكات كە لقە فیقهیەكانی لە سەر بنیات دەنرێت كە ژمارەیان ٥ دانەیە.

### بەیتی بیست و سێ و بیست و چوار :

| | |
|---|---|
| وهـذه خمس قواعد ذكـــر | فروع الفـقه فيـها تنحصـر |
| وهي اليقين حكمه لا يرفع | بالشك بل حكم اليقين يتبع |

### بنەمای یەكەم: ( اليقين لا يزول بالشك)

واتە شتێك كە دڵنیایت لە سەری بە هۆی گومانەوە لاناچێت. واتە شتەكە دەگەڕێنیەوە سەر ئەو بارەی كە لە سەری دڵنیایت و گومانەكە لا دەبەیت و ئەمە لای هەموو زانایان بنەمایە و كاری پێ دەكرێت وەك بنەمایەكی گشتی تا ئەو كاتەی بە بەڵگەیەكی شەرعی تایبەت بكرێت و بە پێچەوانەیەوە كار بكرێت. وەك لە لای مالكیەكان سەبارەت بە ئاوڕشێن كردن بە هۆی گومان هەبوون لە بەركەوتنی پیسی ( **النجاسة** ) و دەست شوشتن لە كاتی لەو خەو هەڵسانەوە.

نموونە:

[٥٣] تقريب و تهذيب إيصال السالك في أصول الإمام مالك، أستاذ كريم امصنصف، ل ٤٠

وەك پێویست بوونی بەڵگە هێنانەوە لە لایەن داواکار لە بەر ئەوەی لە بنچینە دا داوا لێکراو بە بێ تاوان دادەنرێت.

بەڵگەی شەرعیش لە سەر ئەم بنەمایە بریتیە لەو فەرمودەیە کە نسائی تخریجی کردووە لە عبدالله بن زيد **قال: شكي إلى النبي صل الله علية و سلم الرجل يجد الشيء في الصلاة، قال: لا ينصرف حتى يجد ريحا (أو يسمع صوتا).**[54] واتە پیاویك سکاڵای هینایە بەردەم رسول الله صل الله علیه و سلم کە پیاو هەندێ جار لە نوێژ هەست بە شتێك دەکات، فەرموی: دەرنەچووە هەتاوەکو بونی دێت ( یا گوێ ی لە دەنگە کە دەبێت). ئەم فەرمودەیە وامان بۆ دەردەخات کە کار بە یقین دەکرێت و شك و گومان وەلا دەنرێت تا ئەو کاتەی بەڵگەیەکی ئاشکرامان دەست دەکەوێت.

نموونەی تر لە سەر ئەم بنەمایە ئەوەیە لە نوێژ گەر نەزانرا ( ٣ )ڕکاتمان کردووە یا چوار ئەوا کەمترین ژمارە کە دڵنیاین لە سەری وەردەگرین کە ئەویش ( ٣ )ڕکاتە.

و نمونەش بۆ شك و گومان هەبوون لە سەر، بەربەستی حوکمی شەرعی وەك: گومان هەبوونە لە کەوتنی تەلاق ئەوا گومان هەبوون بە هۆیەوە حوکمی یەقینی پێ ناکەوێت و لا ناچێت کە بریتیە لە بەردەوام بوونی هاوسەرێتی و حەلال بوونی چێژ لە یەکتر وەرگتن. و نموونەش بۆ گومان لە هۆکار و سبب وەك: کاتی نوێژ، ئەوا هەبوونی گومان لە هاتنی کاتی نوێژ نابێتە هۆی واجب بوونی نوێژ لە بەر ئەوەی نەهاتنی وەختەکەی دڵنیابوونی لە سەرە و بە هۆی گومان کاتەکە ناچەسپێت. و نموونەش بۆ گومان لە مەرج وەك: گومان کردن لە هەبوونی دەستنوێژ، گەر گومان هەبوو لێ ی ئەوا نابێتە هۆی جێگای مەرجەکە کە ئەویش بریتیە لە دروست بوونی نوێژ، لە بەر ئەوەی دەست نوێژ نەبوون ئەو شتەیە کە یەقینی لە سەرە پێش گومانەکە.[55]

**بەیتی بیست و پێنج :**

**وضرر يزال والتيسير مع مشقة يدور حيثما يقع**

**بنەمای دووەم: ( الضرر يزال)**

لەم بەیتە باسی دوو بنەما دەکات کە یەکێکیان بریتیە لە ( **الضرر يزال**) واتە زیان لە سەر ئەو کەسەی زیانی پێ کەوتووە لا دەبردرێت .

بنچینە و سەرچاوەی کە ئەم بنەمایەی لێ وەرگیراوەلە قورئان و سوننەت بریتیە لە:

**لە قورئان:**

١ - قوله تعالى: ﴿ **وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا** ﴾ البقرة: ٢٣١

---

[54] سنن النسائی، کتاب الطهارة، باب الوضوء من الريح برقم ١٦٠

[55] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ٢٨،٢٩

٢ - قوله تعالى: ﴿ **وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ** ﴾ الطلاق: ٦

٣ - قوله تعالى: ﴿ **لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ** ﴾ البقرة: ٢٣٣

**لە سوننەت:**

عن أبي سعيد الخدري، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم، قال: **(لا ضررَ ولا ضرار، من ضارَّ ضرَّه الله، ومن شاقّ شق الله عليه).**[٥٦]

لە بەر ئەوەی شەریعەت لە سەر قازانج گەیاندن و لابردنی خراپە بنیات نراوە. هەروەها ئەم بنەمایە بنچینەیە بۆ ڕێگرتن لە زیان گەیاندن بە خەلکی و هەروەها لابردن و قەرەبۆ کردنەوەی زیانەکان و بنەمایەکی زۆر گرنگە کە زانایان بۆ بڕیار دان لە حوکمە شەرعیەکان لە ڕووداو و بابەتە هەنوکەییەکان بە کاری دەهێنن.

سەبارەت بە جیاوازی لە نێوان ( **الضرر** ) و ( **الضرار**)، الخشینی دەلێت: ( **الضرر**) بریتیە لەو کارەی کە بۆ تۆ قازانجی هەیە و بۆ جیرانەکەت زیانی هەیە و ( **الضرار**) بریتیە لەو کارەی کە بۆ تۆ هیچ قازانجی نیە و بۆ جیرانەکەت زیانی هەیە. هەروەها ووتراوە کە ( **الضرر**) ئەو زیانەیە کە بە ئەنقەست و بە مەبەست دەکرێت و ( **الضرار**) ئەو کارەیە کە زیانی لێ دەکەوێتەوە بە نا ئەنقەست. هەروەها ووتراوە ( **الضرر**) بریتیە لە یەکەم کار کە زیانی لێدەکەوێتەوە هەر لە سەرەتاوە و ( **الضرار**) بریتیە لە ولامدانەوە و تۆلەکردنەوە.

**دیارە هەندێ بنەمای لاوەکی دەچنە ژێر ئەم بنەما سەرەکیە وەك:**

- **الضرر يدفع بقدر الإمكان** واتە بە قەد توانا زیان لا دەبرێت
- **الضرر لا يزال بالضرر** واتە زیان بە زیانێکی تر لانابرێت.
- **يتحمل الضرر الخاص؛ لأجل دفع ضرر العام** واتە زیانی تایبەت قبول دەکرێت لە پێناو لابردنی زیانی گشتی.
- **إذا تعارض مفسدتان، روعي أعظمهما ضررًا بارتكاب أخفهما** واتە گەر دوو خراپە کەوتنە بەرامبەر یەکتر ڕەچاوی زیانەگەورەکە دەکرێت و زیانە بچووکە کە هەلدەژێردرێت. وقيل: **الضرر الأشد يزال بالضرر الأخف** واتە زیانی گەورە لادەبرێت لە ڕێگەی زیانە بچووکەکە .هەروەها ووتراوە: **يختار أهون الشرين** واتە بچووکترین خراپە هەلدەچێردرێت .
- **درء المفاسد أولى من جلب المصالح** واتە لابردنی خراپە لە پێش قازانج گەیاندنەوەیە.

**نموونە:**

١. دەکرێت ئەوانەی بە لەشفرۆشی و خراپەکاری بە ناوبانگن زیندانی بکرێن تا ئەو کاتەی تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە هەرچەندە تاوان و گوناهێکیان لە سەر ساغ نەبووبێتەوە لە پێناو ڕێگرتن لە خراپەکاریەکەیان.

---

[٥٦] بە هەمان مانا ڕیوایەت کراوە لە: سنن ابن ماجه ٢٣٤١، موطأ مالك ٢١٧١، مسند إمام أحمد ١٨٦٥

٢. گەر کەسێك میوە و بەرووبومێك بفرۆشێت و کڕیار ئامادەنەبێت و ترس لە بۆگەن بوونیان هەبێت، ئەوا فرۆشیار بۆی هەیەفرۆشتنەکە پوچەل بکاتەوە و بیانفرۆشێتە کەسێکی تر لە پێناو لابردنی زیان.[٥٧]

## بنەمای سێیەم: ( المشقة تجلب التیسیر)

هەر لەم بەیتە دا باس لەو بنەمای سێیەم کراوە کە ئەویش دیسان یەکێکە لە بنەما هەرە گرنگەکان لە بواری شەریعەت و حوکمە فیقهیەکان و پەیوەندیەکی توند و تۆلی بە ئامانجەکانی شەریعەت هەیە، کە ئەویش بریتیە لە ( **المشقه تجلب التیسیر**) واتە قورسی و ماندوو بون وا دەکات ئاسانکاری هەبێت.

سەرچاوەی ئەم بنەمایە لە قورئان و سوننەت:

**قورئان:**

١. قول الله تعالى: ﴿ **يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ** ﴾﴿١﴾.

٢. قولە تعالى: ﴿ **لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا** ﴾﴿البقره: ٢٨٦﴾

٣. قولە تعالى: ﴿ **يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ** ﴾﴿النساء: ٢٨﴾

**سوننەت:**

٤. فەرمودەی ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێت لە پێغەمبەری خۆشەویست صل الله علیه و سلم کە دەفەرموێت: "**یسروا ولا تعسروا، وبشروا ولا تنفروا**". متفق علیه

٥. فەرمودەی دایکمان عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت کە دەفەرموێت پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم لە نێوان دوو کار سەرپشك نەکرا ئیلا ئاسانەکەی هەلدەبژارد مەگەر گوناهی تێدا هەبوایە، گەر گوناهی تێدابوایە ئەوا ئەو لە هەموو کەس لێ ی دوور تر بوو. ( صحیح البخاری ٨/١٦٠).

**هەروەها لە لقەکانی ئەم بنەمایە بریتین لە:**

کارکردن بە سووك ترین ( **الأخذ بالأخف**)، مۆلەتەکان ( **الرخص**) وەك دروست بوونی کورت کردن و کۆکردنەوە ( **القصر و الجمع**) و هەروەها ڕۆژوو شکاندن لە سەفەر.هەروەها ( **إذا ضاق الأمر إتسع**) هەرکات کارەکە تەسك بووەوە ئەوا فراوان دەکرێت، هەروەها ( **إذا إتسع الأمر ضاق**) گەر کارەکە فراوان بوو بەرتەسك دەکرێتەوە، هەروەها ( **الضرورات تبیح المحظورات**) واتە پێویستی تەنگانە دەبێتە هۆی ڕەوا بوونی ئەو شتانەی کە ڕێگە پێنەدراون، هەروەها ( **الضرورة تقدر**

[٥٧] ویبسایتی ئەلوکە، بابەتێك بە ناوی بنەمای لابردنی زیان، أبوالكلام شقيق القاسمی المظاهری https://www.alukah.net/sharia/0/86917/

**بقدرها)** واتە پێداویستی بە ئەندازە كەی پیوانە دەكرێت، هەروەها **( ما جاز لعذر بطل بزوالة)** واتە ئەوەی بە هۆی عوزر ڕەوا دەبێت بە نەمانی نامێنێت، هەروەها **( الحاجة تنزل منزلة الضرورة)** واتە پێویستی دێتە شوێنی پێویستی ناچاری، هەروەها **( الإضطرار لا يبطل حق الغير)** واتە ناچار بوون مافی خەلكی بە فیڕۆ نادات)، هەروەها **( الميسور لا يسقط بالمعسور)** واتە گەر نەتوانرا كارێك بە تەواوی ئەنجام بدرێت ئەوەی لەم كارە توانای ئەنجام دانی هەیە ناكەوێت.[٥٨]

قەرافی دەڵێت: سەختی و دژواری **( المشقة)** دوو جۆری هەیە: بەشێكیان لە عیبادەت جیا نابێتەوە ئەمەیان نابێت سووك بكرێتەوە لە بەر ئەوەی عیبادەتی لە گەلدا دەكرێت وەك دەست نوێژ هەلگرتن لە سەرما و بە ڕۆژوو بوون لە گەرما. بە شێكیشیان لە عیبادەت جیا دەكرێتەوە و ئەمەیان خۆی سێ ٣ بەشە: گەر لە پێداویستیە گرنگەكان**( الضروريات)** بوو ئەوا بە كۆدەنگی دەبەخشرێت وەك ئەوەی تێچوونی نەفس یا ئەندامێكی جەستەی بەدواوە بێت، گەر لە ئاستی تەواوكەرەكان **( التتميمات)** بوو ئەوا بە كۆدەنگی لێ بووردن لێ ی نیە وەك ئەوەی تەنیا ماندوو بوونی تیابێت، و گەر لە ئاستی پێویستیەكان **(الحاجيات)** بێت ئەوا جێگای ناكۆكیە لە نێوان زانایان وەك ئەوەی نەخۆشیەكی سووكی بە دواوە بێت. [٥٩]

**هەروەها هەندێك جۆرەكانی لە سەر سووك كردنیان بە ٧ جۆر پۆلێن كردووە:**

١. لە سەر سووك كردنی **(هەلگرتن)**: وەك هەلگرتنی نوێژ لە سەر ئافرەتی بێ نوێژ و تازە منال بوو یا ئەوەی زیاتر لە شەوو ڕۆژێك لە هۆش خۆی دەچێت هەروەها واجب نەبوونی حەج گەر ڕێگا لە ڕووی ئاسایشەوە هەموار نەبێت و ئافرەت گەر مەحرەمی لە گەلدا نەبوو.
٢. لە سەر سووك كردنی **( كەم كردنەوە)**: وەك كورت كردنەوەی نوێژ لە سەفەر و نوێژ كردن بە دانیشتنەوە و لە سەر پشت و بە هێما و ئیشارە بۆ نەخۆش
٣. لە سەر سووك كردنی **(گۆڕینەوە )**: وەك تەیەموم كردن لە جیاتی دەستنوێژ هەلگرتن و سەرشووشتن، هەروەها دانیشتن و پالكەوتن لە جیاتی هەستانە سەر پێ لە نوێژ، و خواردن بە خشین لە برِی ڕۆژووەانێك كە لە بەر بەسالاچوون توانای بە ڕۆژوو بوونی نیە.
٤. لە سەر سووك كردنی **(پێش خستن)**: وەك كۆكردنەوی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر لە عەرەفات، و هەروەها پێش خستنی زەكات پێش بە سەر چوونی ساڵ.
٥. لە سەر سووك كردنی **(دواخستن)**: وەك دواخستنی ڕۆژووی ڕەمەزان بۆ دوای ڕەمەزان بۆ ڕێبوار و ئافرەتی بێ نوێژ و تازە منال بوو و نەخۆش، هەروەها دواخستنی نوێژ بۆ ئەو كەسەی خەریكی نەجات دانی كەسێكە لە نوقوم بوون یا ڕزگار كردنی نەخۆشێك كە مەترسی مردنی لە سەرە.
٦. لە سەر سووك كردنی **(ناچاری)**: وەك خواردنی گۆشتی مردار و هەروەها تەماشاكردنی عەورەتی نەخۆش لە ناچاری.
٧. لە سەر سووك كردنی (گۆڕانكاری): وەك گۆڕینی شێوەی نوێژ كردن لە كاتی ترس ( صلاة الخوف). [٦٠]

---

[٥٨] تقريب و تهذيب إيصال السالك في أصول الإمام مالك، أستاذ كريم امصنصف، ل ٤٣
[٥٩] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ٢٨
[٦٠] ويبسایتی ئەلوكە، بابەتێك بە ناوی بنەمای لابردنی زیان، أبوالكلام شقيق القاسمي المظاهري، https://www.alukah.net/sharia/0/85503/

**بەیتی بیست و شەش :**

**وكل ما العادة فیه تدخل من الأمور فهي فیه تعمل**

**بنەمای چوارەم: ( العادة المحكمة)**

لەم بەیتە دا دەڵێت هەر كارێك یا شتێك كە نەریت و عادەت ڕێ ی تێ بچێت ئەوا كاری پێ دەكرێت.

ئەم بنەمایە بە كورتی بە ( **العادة المحكّمة**) ناوبراوە، واتە عادەت و نەریتی باو كاری پێ دەكرێت ( **المحكمة**) بە زەمی میم و تشدید و فەتح ی كاف. و بە چەند ناوی تریش ناوبراوە وەك: ( **المعروف عرفا كالمشروط شرطا**) و ( **العرف كالشرط**)، هەروەها ( **العبرة للغالب الشائع لا للنادر**) واتە حساب بۆ زۆرینەی باو دەكرێت نەوەك بۆ دەگمەن، هەروەها ( **الحقيقه تترك بدلاله العاده**) واتە مانا ڕاستەقینەكە وازی لێ دەهێنرێت بە هۆی مانای عادەتی ناو خەڵكی، هەروەها ( **الإشارة المعهودة للأخرس كالبيان باللسان**) واتە: ئاماژەی باوی كەسێكی لاڵ واتە ئەو كەسەی ناتوانێت قسە بكات وەك ئەوە وایە بە زمان دەربڕێت، هەروەها ( **المعروف بين التجار كالمشروط بينهم**) واتە: ئەوەی لە ناو بازرگانەكان باوە وەك ئەوە وایە بە مەرج دانرابێت.

عادەت بریتیە لە كارێك كە دووبارە دەبێتەوە و لە ڕووی زاراوە بریتیە لە و كارانە كە دووبارە دەبنەوە و لای عەقڵ جێگای دەبێتەوە و لای ئەو كەسانە جێگەیان دەبێتەوە كە خاوەن سروشتی پاكن.

بەڵگەش لە قورئان و سوننەت بریتیە لە :

**لە قورئان:**

١- قوله تعالى: ﴿ **وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ** ﴾ البقرة: ٢٢٨

٢- قوله تعالى: ﴿ **وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ** ﴾ النساء: ١٩

**لە سوننەت:**

و نەریت و عادەتی خەڵكی ( **گوفتار و كردار**) بە هۆیەوە دەقەكان گەر گشتی بوون تایبەتی دەكات و گەر ڕەها بوون سنووورداری دەكات. لە عادەتی خەڵكی لە ڕووی گوفتاری بە زۆری بریتیە لە بە كار هێنانی ووشە و واژەیەك لە غەیری مانا سەرەكیەكەی خۆی. وەك لە سوێند خواردن و مامەڵە لە گرێبەستە كان و هەڵوەشاندنەوە و دانپیانان و داواكاری.

نموونەبۆ تایبەت كردن واتایەكی گشتی وەك: ئەوەی سوێند بخوات سواری سەر پشتی ئاژەڵێك نەبێت كە لە سەر چوار پەل دەڕوات گەر سواری سەر پشتی شتی تر بوو كە چوار پەلیان نیە و بە عادەت بۆ سوار بوونە سەر پشتیان دەشێن ئەوا سوێندەكەی نەشكاندووە.

نموونەی تر وەك حوكم دان بۆ خاوەندارێتی ڕایەخ و بالیف بۆ ئافرەت گەر بووە جێگای ناكۆكی گەر پیاوەكە بەڵگەی نەبوو لە بەر ئوەی بە پێ ی نەریت ئەم شتانە بۆ ئافرەت دەگەڕێنەوە.

**بەیتی بیست و حەوت و بیست و هەشت :**

| | |
|---|---|
| **وللمقاصـد الأمـور تتبـع** | **وقيل ذي إلى اليقين ترجع** |
| **وقيل للعرف وذي المقاصد** | **خمستها لا خـلف فيها وارد** |

**بنەمای پێنجەم: ( الأمور ترجع إلى المقاصد أو اليقين أو العرف)**

مانای بەیتەكە ئەوەیە: شت لە سەر ئامانج و مەبەستەكان بنیات دەنرێت و هەندێكیش دەڵێن بۆ یەقین دەگەڕێتەوە و هەندێكیش دەڵێن بۆ نەریت دەگەڕێتەوە. و ئەم پێنج بنەمایەی كە باس كرا زانایان لە سەریان كۆكن كە بنچینەی كارپێكراون بۆ بنیاتنانی لقە شەرعیەكان لە سەریان.

ئەم بنەمایە مشتومڕی لە سەرە، هەندێك دەڵێن شت لە سەر مەبەست و ئامانجەكەی بنیات دەنرێت و هەندێك بۆ یەقین دەیگەڕێننەوە و هەندێكی تریش بۆ لای نەریت.

ئەوانەی دەڵێن سەرچاوەی كارەكان بۆ ئامانج و مەبەستە واتە تەماشا دەكەی گەر ئامانجەكا باش بوو ئەوا حوكمی كارەكە باشە و گەر خراپ بوو ئەوا حوكمەكەی خراپە وەك جیا كردنەوەی عیبادات و عادات ئەمە لە سەر نیەت و ئامانج و مەبەست دەوەستێت و نیاز و مەبەست مەرجی دروست بوونی عیبادەتەكانە و مەرجی دەست كەوتنی پاداشتە لە هەموو كار و كردەوەكان و هەندێ پێیان وایە كە بنەمای ڕێگرتن لە مەهانە بۆ خراپە ( **سد ذرائع**) دەچێتە پاڵ ئەم بنەمایە كە پێشتر شیمان كردۆتەوە. و بە گشتی سەرچاوەی شەرعیش بۆ ئەم بنەمایە بریتیە لە فەرمودەی ( **إنما الأعمال بالنيات و إنما لكل امريء ما نوى**) واتە بەڕاستی هەموو كردەوەكان بە نیەت جیادەكرێنەوە و هەركەسێك و نیەتەكەی).

ئەوانەش دە كدەڵێن یەقین بریتیە لە بنەمای كارەكان ئەوەش هەمان سەرچاوەی كە پێشووتر شیمان كردەوە دەگرێتەوە كە بریتیە لە (**اليقين لا يزول بالشك**) واتە شتێك كە یەقینی لە سەر بێت بە هۆی گومانەوە لاناچێت.
ئەوانەش كە دەلێن بۆ نەریت دەگەڕێتەوە هەمان بنەمای پێشوو كە باس لە عادەت و نەریت دەكات لە خۆ دەگرێت كە شی كرایەوە.[٦١]

---

[٦١] إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي، ل ٣٠

**بەیتی بیست و نۆ و سی :**

| | |
|---|---|
| **قد تم ما رمـت ولله الحمــيد** | **مني حمد دائم لا يبيد** |
| **وأطيب الصلاة وأسنى السلام** | **على محمد وآله الكـرام** |

له کۆتاییدا دانەری ئەم مەنزومە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت ئەوەی نیازم بوو بە کۆتام گەیاند و ستایشی خوای تعالی دەکات بە بەردەوام و بێ پچران و بێ کۆتایی و سەلەوات دەنرێت و سەلام بۆ پێغەمبەری خۆشەویست صل الله علیه و سلم وەك ڕێباز و ڕێچکەی هەموو زانایان کە لە نوسین و قسە کردن بە ستایش بۆ خوای تعالی و دواتر سەلەوات لێدان بۆ پێغەمبەرەکەی صل الله علیه و سلم دەست پێ دەکەن و کۆتایی پێ دێنن.

# کۆتایی

شوکرانەبژێری دەکەم کە الله سبحانه و تعالى مۆڵەتی پێدام ئەم نامیلکەیە کۆتایی پێ بهێنم و لە هەر شتێك گەر پێکامان بێت ئەوا لە ڕوحم و بەزەیی و فەزلی خوای تعالایە و لە هەر شتێك هەڵەمان کردبێت ئەوا لە شەیتان و نەفسی خۆمانە.

دووبارە جەخت دەکەمە و کە تێگەیشتن لە دەقە شەرعی و زانستیە کان، لە پێش لە بەر کردنە لە ڕووی گرنگی هەرچەندە لە ڕووی کرداری لە بەر کردن ئێنجا تێگەیشتن دێت. بۆیە هانی هەموو فێر خوازێك دەدەم کە دەیەوێت لە زانستی شەرعی شارەزا بێت ئەوا لە هەر بابەتێك چەند دەقی کورت یا مەنزومە لە بەر بکات و بە دیرایەت شیکردنەوەکەشی بخوێنێت لای مامۆستای پسپۆر و شارەزا و خواناس بە تایبەت زۆر گرنگە ئەو زانایە لە ڕووی عەقیدەوە لە سەر عەقیدە و بڕوای ئەهلی سوننەت بێت و خاوەن تەقوا و خواناسین بێت هەتا وەکو زیاترین سوودی لێ ببێنرێت. لە خوای تعالی دەپارێمەوە ڕەحمەت و بەزەیی و لێبوردنی خۆی شمولی دانەری ئەم مەنزوومەیە و هەموو ئەو زانایانە بکات کە سوودمان لە نوسین و بەرهەمەکانیان بینیوە بۆ شیکردنەوەی ئەم مەنزومە موبارەکە لە زانستی ( أصول) و لە خوای تعالی دەپاڕێمەوە لە ئێمە و هەموو موسلمانان خۆش بێت و روحممان پێ بکات بە تایبەت ئەو زانستخوازانەی کە ئەم نامیلکەیە دەخوێننەوە. خوای تعالی بە صەدەقەی جاریە لێمان قبول بکات و بەرەکەت داری بکات.

داوا لە بەڕێزتان دەکەم لە تێبینی و ڕخنە و پێشنیارەکانتان بێ بەشمان مەکەن و دوعای خێر بۆ خۆمان و دایك و باوکمان و مامۆستا بە ڕێزەکانمان بکەن و ئیتر خوای تعالی پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە.

بەندەی هەژاری خوا

عبدالرحمن شمس الدین عیمان نزاری

رۆژی شەممە ٢٩ ی رجب ١٤٤٢ هیجری

بەرامبەر ١٣ ئاداری ٢٠٢١ زایینی

# مافی لە بەرگرتنەوە و چاپ و بڵاوکردنەوە



تێبینی: شیکردنەوەی (مەنزومەی ابن أبی کف ) لە لایەن دانەری ئەم پەرتوکە بە شیوازی تۆماری دەنگی لە ( ) وانە هەیە و ئەوەی بیەویت دەتوانیت سود مەند بێت و لە کەنالی ذخائر السنة للعلوم الشرعیة دەستی دەکەوێت.



https://t.me/joinchat/laGCjR_v4o45NzAy

خوای تعالی پاداشتی ئیوەش بداتەوە کە کاتتان تەرخان کرد بۆ خوێندنەوەی ئەم پەرتوکە.

تکایە لە هەر کەم و کوڕیەك ئاگادارمان بکەنەوە.

## هۆکارەکانی پەیوەندی:






07507658019





عبدالرحمن النزاری
أکادمیة ذخائر السنة للعلوم الشرعیة



Abdulrahman160877@gmail.com

# سەرچاوەکان

- **الإستحسان و نماذج من تطبيقاته في الفقة الإسلامی**، د. فاروق عبدالركيم
- **أصول مذهب الإمام أحمد، د. عبدالله بن عبدالمحسن التركي**
- **الانتقاء**، ابن عبدالبر
- **إيصال السالك في أصول إمام مالك، سيدي محمد يحيى بن عمر المختار الشنقيطي**
- **تقريب و تهذيب إيصال السالك في أصول الإمام مالك، أستاذ** كريم امصنصف
- **ثلاثون مثالا على دلالة الإقتضاء، د. ربيع أحمد، موقع الألوكة** https://www.alukah.net/sharia/0/73903/
- **رواة المُوطأ عَن مَالك بن أنَس رَحِمَه الله، د. محمد بن علي اليـولو الجزولي، بحث منشور في موقع الرابطة المحمدية للعلماء مغرب**
- **زاد الطالب في أصول الفقة، أبو** براء المصري
- **زاد الطالب في أوصل الفقة، أبو لبراء المصري**
- **شیکردنەوەی مەنزومەی ابن أبی کف، ئەبو ماریە تەمیمی، مكتبە شاميلە**
- **العدة في أصول الفقه، لقلضي أبو يعلى المكتبة الشاملة**
- **علم أصول الفقة نشأتة و تطوره،**
- علم أصول الفقة: مفهومة و نشأتة و مناهجة و أهم مؤلفاتة ، نعمان جغيم
- الفروع و تصحيح الفروع، شيخ الإسلام إبن تيمية، مكتبة الشاملة
- كتابي ( ماليك)، محمد ئەبو زوهرة،
- كتابي سير اعلام النبلا ی ئیمامی زەهەبي م. شاملة
- مجموع الفتاوى، ابن تيمية
- **مذكرة** أصول الفقة، ازانكۆی ئیسلامی **لە مەدینەی منورە**
- **مذكرة في أصول الفقه، محمد أمين بن محمد المختار لشنقيطي**
- مراتب الإجماع لإبن حزم
- **المعونه لە سەر مەزهەبی زانای مەدینە، سەعلەبی**
- الوجيز في أصول الفقة، د. عبدالركيم زيدان
- الورقات، لأبي معالي الجوينى
- **ویبسایتی ئەلوکە، بابەتێك بە ناوی بنەمای لابردنی زیان، أبوالكلام شقيق القاسمى المظاهري** https://www.alukah.net/sharia/0/86917/
- **ویبسایتی ئەلوکە، بابەتێك بە ناوی بنەمای لابردنی زیان، أبوالكلام شقيق القاسمى** المظاهري، https://www.alukah.net/sharia/0/85503/

# پێرس